# فەتوا بلێسە دارەکان

شەست و چوار پرسیار و وەلام

کە وەلام دراوەتەوە لە لایەن شێخ

## ناصر بن حمد الفهد

وەرگێرانی

خانی کوردستانی

## پێشەکی :

الحمدلله و الصلاة و السلام علی رسول الله ، پاشان :

ئەمە هەندێك بابەت و فەتوای کورت و پوختە کە شێخ و گەورەمان ناصر الفهد خوا پاداشتی بداتەوە وەڵامی داونەتەوە ، خوای پەروەردگار بۆی ئاسان کردم لە زیندان بیهێنمە دەرەوە کە لە چەند بەشێك پێکهاتووە ، پێم خۆشبوو براکانم بەشداربن لە سوود لێوەرگرتنیدا ، خوا بیکات بە مایەی سوود و قازانجی دنیا و دوارۆژمان ، خوا پاداشتی شێخمان بداتەوە و بیپارێزێت و سەری بخات بەسەر دوژمنانیدا و لە باشترین حاڵدا کۆمانبکاتەوە لەگەڵیدا ، هەر خۆی بە توانا و نزیك و وەڵامدەرەوەیە .

لێرەوە ئاگادارتان دەکەمەوە کە پێشەوامان وەڵامی بەوە داوینەتەوە کە لە بیریدا بووە ، بەبێ هیچ گەڕان و گەڕانەوەیەك بۆ سەرچاوەکان ، بەهۆی نەبوون و دەست نەکەوتنی لە زینداندا ، لەبەرئەوەش لە چەند شوێنێکدا دەبینیت کاتێك بابەتێك دەگەڕێنێتەوە بۆ کتێبێك بە گومانە لە ژمارەی لاپەڕەکەی ، بەڵکو ان شاء الله دەست و بردی برایەکی لێ هەڵبکەوێت و لێکۆڵینەوەیەکی ڕێکوپێکی لێ بکات .

أبو مهند الجزراوي

1435کۆچی

## ناساندنێکی شیخ ناصر الفهد ﴿خوا ئازادی بکات﴾[1]

ناو و ڕەچەڵەك و شوێنی خێزانەکەی :

ناوی ناصر کوڕی حەمەد کوڕی حەمین کوڕی حەمد کوڕی فەهده ، لە خێڵی الأساعدة الروقيتيه ، ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ بني سعدی کوڕی بەکر کە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم شیری لێیان خواردووە , و بە عتيبة ناسراون . دایکی ناوی نورة الغزي ـيە و ڕەچەڵەکی ئەگەڕێتەوە سەر بەدرییە دۆسەرییەکان .

ماڵی خێزانەکەی لە الثويربوو ، کە یەکێکە لە گوندەکانی زلفی ، پاشان ماڵی باوکی کۆچیان کرد بەرەو ریاض : بۆ کارکردن لەلای شیخی عەللامە محمدی کوڕی ابراهیم ﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ ، هەژدە ساڵ لەلای مایەوە هەتا کۆچی دوایی کرد .

ساڵی لە دایکبوونی و کورتەیەك لە ژیانی و چۆنییەتی وەرگرتنی زانست :

لە ساڵی 1388کۆچی لە ریاض لە دایکبووە و هەر لەوێش گەورەبووە ، دوای ئەوەی قۆناغی ناوەندی تەواوکرد لە زانکۆی ملك سعود لە کۆلێژی ئەندازیاری وەرگیرا و ئاستێکی دیار و پێشکەوتووی هەبوو تیایدا ، دوای ئەوەی دەگاتە قۆناغی سێیەم وازی لێدەهێنێت و دەچێتە کۆلێژی شەریعە لە زانکۆی ئیمام محمدی کوڕی سعودی ئیسلامی ، بە سێ مانگ هەموو قورئان لەبەر دەکات ، لە لاپەڕەی یەکەمی ئەو قورئانەی کە تیایدا هەمووی لەبەرکردبوو نووسیویەتی : ﴿سوپاس بۆ خوا و بە یارمەتی خوا تەواوبووم لە تەواوکردن و خەتم کردنی

---

[1] سەرچاوەی ژیاننامەکە لە کوڕەکەی شیخ ناصرەوە وەرگیراوە

قورئان ﴿بەلەبەرکردن﴾ بەیەکجار دوای نوێژی عەسر ، لە ڕۆژی یەکشەممە بەرواری بیست و سێی ذي القعدةی ساڵی هەزار و چوارسەدو دوانزەی کۆچی پێغەمبەر صلوات الله و سلامه علیه ، و سەرەتای لەبەرکردنەکە لە سەرەتای ڕەمەزاندا بوو لە هەمان ساڵدا . والحمدلله الذی بحمده تتم الصالحات .﴾ .

لە کۆلێژی شەریعە لەسەر دەستی کۆمەڵێك زانا دەرچوو ، دیارترینیان : شیخ عبدالعزیز الراجحي ، و شیخ زید کوڕی فیاض ﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ ، و شیخ أحمد معبد الأزهري .

لە ساڵی 1412ی کۆچی لە کۆلێژ بە پلەی یەکەم دەرچوو .

لە ساڵی 1415 لە بەندینخانەی حایر بۆ ماوەی سێ ساڵ بەند کرا پاشان لە ساڵی 1418 ئازادکرا .

کاتێك خوا موسڵمانانی ڕووبەڕووی جەنگی ئەمریکا کردەوە لە بەرانبەر ئەفغانستاندا ، شیخ ناصر هانی موسڵمانانی باوەڕداری دەدا بۆ سەرخستنی براکانیان و ئاگاداری دەکردنەوە لە پشتیوانی کردنی کافران لە بەرانبەر موسڵماناندا ، نەگەیشتە دەستکەوتەکەی هەتا داواکراو لە ساڵی 1424 خرایەوە بەندینخانەوە ، هەتا ئێستاش ﴿کە 1437ی کۆچییە﴾ لەناو زیندانی تاکەکەسیدایە ، هەر لەناو زینداندا ماوەی شەش ساڵ دووریان خستبۆوە لە بینین و پەیوەندی کردن بە خێزانەکەیەوە .

خوا دەرگاکانی بەرەکەتی خۆی لێکردەوە لە زینداندا و دەستی بۆ وەرگرتنی زانست کردەوە ، لێرەوە نۆ کتێبەکەی فەرموودەی لە کۆکردنەوەی یحیی لەبەرکرد و بەشێکی باشی لە کتێب و مەتنە زانستییەکان لەبەرکرد ، شەش جار ﴿مجموع الفتاوی﴾ی خوێندۆتەوە ، هەشتاوپێنج

نامیلکەی نووسیوە ، برایەك کە تازە بەندکرابوو پێی وتم : هەندێ لە سەربازەکان دەڵێن : ئەرێ ئەم پیاوە وەسواسە چییە ﴿مەبەستیان شیخ ناصرە﴾؟! چوار کاژێر دەخەوێت ، باقی وەختەکەی نوێژ دەکات و دەخوێنێتەوە!!! .

لە زینداندا خرایە بەر فیتنە و سزادان و دەیانویست خاوببێتەوە بەڵام شیخ ناصر قبوڵی نەکرد، هەتا ئێستاش بە جێگیری و ئارامگری ژیان بەڕێ دەکات ، خوا دامەزراوی زیاد بکات و لە زیندان ئازادی بکات .

وتەی ئەوانەی قسەیان لەبارەوە کردووە :

شیخی عەللامە حمود الشعیبي﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ لە مەدحکردنی بۆ کتێبی ﴿تبیان في کفر من أعان الأمریکان﴾دا فەرموویەتی : شیخ ناصر ﴿خوا سەرکەوتووی بکات﴾ هەوڵ و تێکۆشانێکی موبارەکی هەیە ، هەوڵ و تێکۆشانی خستەگەڕ بۆ سەرخستنی حەق و ئەهلەکەی ، و بەربەرەکانێی لەگەڵ باتڵ و لایەنگرانیدا کرد ، لە کۆمەڵێك زۆر لە کتێب و نامیلکەی ناسراودا بەرپەرچی داونەتەوە ، داوا لە خوا دەکەم کە خێر و پاداشتی بۆ بنووسێت و جێگیری بکات لەسەر ئەو ڕێگەیە .

هەندێك برا پێیان وتم ، ئەڵێن : ئەو برایانە کاتێك بهاتنایە بۆلای شیخ حمود الشعیبی شوبهەیەکیان بخستایەتە بەردەستی بۆئەوەی وەڵامی بداتەوە ، دەیفەرموو : شیخ ناصر ڕەددی داوەتەوە؟ .

شیخ سلیمان علوان ﴿خوا ئازادی بکات﴾ لەبارەی وەسفی کتێبی ﴿تبیان في کفر من أعان الأمریکان﴾ فەرموویەتی : خوا شیخ ناصر سەرکەتوو بکات بۆ ئەو کتێبە بەنرخەی کە

نووسویەتی ، بە ڕاستی لەو کەسانەیە کە پلەوپایەی بەرزی هەیە لەناو ئەهلی عیلم و قوتابیانی زانستی شەرعیدا .

هەروەها شیخ سلیمان دەفەرموێت : لەوانەی کە کوڕەکەی شیخ سلیمان ، عبدالملك لێی گێڕاوەتەوە ، دەفەرموێت : شیخ ناصر لە حافیزە شەونخونیکەرەکانە لەسەر زانست ، لەسەر زۆر هونەر زانیاری هەیە ، لە زینداندا ستەمێکی زۆری لێدەکرێت .

هەروەها شیخی فەرموودەناس عبدالله السعد لە وەسفی بۆ کتێبی ﴿منهج المتقدمين في التدليس﴾دا دەفەرموێت : پێشتر سەیری کۆمەڵێك نامیلکەی تری شیخ ناصرم کردووە ، هەموویم پێ بەپێز و بەسوودبووە ، بەپێی بەڵگەی قورئان و سوننەت ڕۆیشتووە و پەیڕەوی سەلەفی صالحی گرتۆتە بەر ، ئێمە وای دادەنێین و تەزکیەی کەس ناکەین لە بەرانبەر خوادا .

**1/ پرسیار : هەندێ کەس کاتێ دەچنە سەر دەسەڵات سەجدە دەبەن بۆ گۆڕی ئەتاتورك ، چونكە ئەوە مەرجێكە لە دەستوردا و نابێت پێچەوانەی دەستور بكرێت ، هەندێك كەسیش هەن كە دەڵێن : لەو حاڵەتانەدا دروستە سەجدە ببرێت بۆ ئەو جۆرە بتانە ، لەبەر بەرژەوەندی ئیسلام ، هەروەها هەندێك لە كۆمەڵە جهادییەكان هەمان قسە دەكەن بۆ نموونە بزووتنەوەی حەماس و بێجگە لەوان ، ئایا حوكمی ئەم جۆرە قسانە چییە و چۆن ڕەددی لێ دەدرێتەوە ؟**

وەڵام : ئەم بابەتە بابەتێكی گەورە و گرانە ، نابێت بە هیچ شێوەیەك كوفر بخرێتە پێشەوە مەگەر كەسەكە لە حاڵەتێكدا بێت كە زۆری لێبكرێت ، هەروەكو لە ئایەتدا هەیە ﴿شخ ناصر ئایەتەكەی نەهێناوە ، ئەمەش ئایەتەكەیە : مَن كَفَرَ بِاللَّهِ مِن بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ . سورة النحل_106.واتە: هەركەسێك لەدوای باوەڕهێنانی كوفر بە خوا بكات مەگەر ئەوەی كە زۆری لێكرابێت و دڵی پڕ بێت لە باوەڕ./ وەرگێڕ﴾ ، هەركەسێك ئەو كوفرە ئەنجام بدات و زۆریشی لێنەكرابێت لەعنەتی خوای لێبێت ئەگەرچی مەبەستیشی خێر بێت ، هەر ئەمەشە بەهۆیەوە زۆربەی ئەو كەسانەی كە لەسەر كاری ئیسلامی دامەزراون لە كۆمەڵێكی زۆر لە دەرگاكانی كوفرەوە چوونەتە ناوەوە بە بانگەشەی ئەوەی كە چاكەی ئیسلامی تێدایە ، هەروەكو ئەو سەجدە بردنەی كە بۆ ئەو گومڕایە ئەتاتورك بردراوە (ئەگەر ڕاستبێت) ، هەروەها وەكو سوێند خواردن لەسەر ڕێزگرتنی دەستور و حوكم بردنەوە بۆلای یاسا دەستكردەكان و نەهێشتن و ڕووخاندنی بیروباوەڕی وەلاء و بەڕاء و بێجگە لەوانیش ، هەر لێرەدا دوو بەڵگە دێنمەوە ، یەكەمیان بۆ ڕوونكردنەوەی پەیڕەوی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم لەبارەی بەرژەوەندی بانگەواز ، دووەمیشیان لەبارەی حوكمی ئەو كەسانەیە كە پەیڕەوێكی جیاواز لە پەیڕەوی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم دەگرنە بەر .

جا یەکەمیان : بریتیە لە ماوەی مەککە ، هەروەکو بە موتەواتیری زانراوە کە چی بەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم و هاوەڵانیدا هات لە مەککە ، لە بەڵا و نارەحەتی و ناخۆشی و چەرمەسەری بە دەستی کافران ، هەیانبوو دەکوژرا ، هەیانبوو ئەشکەنجە دەدرا ، هەیانبوو دەبەسترایەوە ، هەیانبوو دەربەردەر دەکران  وەکو کۆچەرییەکان کە چوون بۆ حەبەشە، هەشیانبوو کە گەمارۆدرابوون وەکو پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم کە سێ دانە ساڵ لە شیوی ئەبو تاڵیب گەمارۆدران هەتا وایان لێهات گەڵای داریان دەخوارد ، چەندانی تریش بێجگە لەوانە . حوکم لە مەککە بە دەست ئەبوجەهل و هاورێکانییەوەبوو ، ئەوان ئەوەیان نەدەویست کە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم خواکانیان بپەرستێت ، بەڵکو دەیانویست بێدەنگ بێت و واز لە تانەدان و قسە وتن بە خواکانیان بهێنێت و تەکفیری خۆیان و باووباپیرانیان نەکات و شتی تریش ، ئەگەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەرمییەکی بنواندایە لەوبارەیەوە ، ئەوە ئەوان خێراترین کەس دەبوون لە واز لێ هێنانی خۆی و هاوەڵەکانی و ئەوەشی کە دەیانەوێت ، بەڵکو لە ژیاننامەدا هاتووە کە سەرۆکایەتییان خستە بەردەستی ، بەڵگەش لەسەر ئەوە ، خوای تعالی ئەفەرموێت : ﴿ودوا لو تدهن فیدهنون﴾ القلم_9 . بۆ مەگەر بەرژەوەندییە گەورەکە و دەستگیرە بەهێزەکە پارێزگاریکردن نییە لە تەوحید و یەکتاپەرستی ، و بەرائەت کردن نییە لە هەمووئەوانەی کە دژی دەوەستێتەوە و زیانی پێ دەگەیەنێت ، کە ئەویش کوفر کردنە بە طاغوت . لەسەر پێوەری ئەم سەردەمییانە ئەوەیە کە بانگەواز بۆ گەیشتنە بە دەسەڵات ، ئەگەرچیش تەوحیدەکە نەپارێزرێت ، لێرەشەوە دەکەوێتە ناو کۆمەڵێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامەوە!!

دووەمیش : ئەوەیە کە لەبارەی خەواریجەوە هاتووە ، کۆمەڵە فەرموودەیەکی زۆر لەبارەیانەوە لەسەر سەرزەنشت کردنیشیان هاتووە ﴿یمرقون من الاسلام : لە ئیسلام دەرچوون(مرق بۆ تیر بەکاردێت کاتێك لە کەوانەکەی دەردەچێت)﴾ ، ﴿شر قتلی قتلی تحت أدیم السماء : خراپترین کوژراون لە ژێر ئاسماندا﴾ ، ﴿کلاب أهل النار : سەگی دۆزەخن﴾ ، ﴿طوبی لمن قتلهم : خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کە دەیانکوژێت﴾..هتد ، ئەگەر چی لەگەڵ ئەوەشدا باسی ئەو بەندایەتییە گەورەیەیان دەکات بۆ خوا ﴿تحقرون صلاتکم إلی صلاتهم و صیامکم عند صیامهم : نوێژ و ڕۆژووی ئێوە لەچاو ئەواندا هیچ نییە﴾ ، ئەوانە خاوەنی شەونوێژ و نوێژ و خوێندنی قورئانن ، ئەمەش لە ژیاننامەکانیاندا دیارە ، هەموو هاوەڵان یەکدەنگبوون لەسەر شەڕ و کوشتاریان و سەرزەنشت کردنیان ، هەروەکو زانراوە کە ئەوانە مەبەستیان خێربوو لەوشتانەی کە دەیانکرد و حەقیان دەویست و ئیسلام و بانگەوازەکەیان بەرز ڕادەگرت ، دووریش بوون لە سەرپێچی و تاوانە گەورەکان هەتا وایان لێهات هەر کەسێکیان کافر دەکرد ئەگەر بکەوتایەتە ناو یەکێك لەو تاوانە گەورانەوە ، لەگەڵ ئەو هەموو شتەدا ئەو ڕێگەیەیان نەگرتبوو کە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم گرتبووی ، ئەو هەموو بەندایەتییە زۆرەیان هیچ شەفاعەتێکیان بۆ ناکەن ، ئەوەش کە کەسەکە بڵێت مەبەستی خێری هەبووە و حەقی ویستووە هیچ سوودێکی نییە و هیچ شەفاعەتێکی بۆ ناکات ، ئەی ئەبێت حاڵی ئەم سەردەمییانە چۆن بێت کە کەوتوونەتە ناو کۆمەڵێك کوفرەوە کە خەوارج تێی نەکەوتبوو ، و ڕێبازێکیان گرتووە بێجگە لە ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم و هاوەڵەکانی ، بەڵکو پێچەوانەی پەیڕەو و ڕێبازی کۆمەڵە موبتەدیعەکانی وەکو خەوارج و موعتەزیلە و زیدی و

ئەشاعرە و بێجگە لەوانن ، کە هیچ یەکێك لەوانە کوفرکردن بە جائیز دانانێن لە پێناوی بەرژەوەندیدا . واللە أعلم

**2/ پرسیار : شیخ الاسلام لە درء التعارض دا دەفەرمووێت : هەروەکو ئەوەی جاری وا هەیە ناتوانرێت ڕووبەڕووی سوپای کافران ببیتەوە مەگەر بەوە نەبێت کە لە جلەکانی ئەوان لەبەر بکەیت و خۆت بخزێنیتە ناویانەوە لە وڵاتی موسڵماناندا دەریانبکەیت بەو جلانەی ئەوانەوە کە لەبەرت کردوون باشترە لەوەی کە وازیان لێ بهێنیت بۆ ئەوەی بەناو وڵاتی موسڵماناندا هاتوچۆ بکەن لە ترسی ئەوەی کە خەڵکی چاویان لێبکەن لە جلەکانیاندا .**

**ئەمەش زۆربەی ئەهلی عیلم پەسەندیان کردووە و کێشە و ناڕوونی تێدایە ، بۆ نمونە ئەگەر کابرا بچێت شتێك بکات کە کوفر بێت وەکو لەبەرکردنی خاچ و بت و ئەو جۆرە شتانە ، ئاڕاستەکردن بۆ کام لا دەبێت لەو جۆرە حاڵەتانەدا؟ بە تایبەتی ئەگەر لە بنچینەی ئێمەدا ئەوە بێت کە کوفر تەنهاوتەنها شتێك ڕێی پێدەدات کە زۆرلێکردنە ، ئینجا وەڵامی بەڕێزتان چییە لەسەر ئەم جۆرە کێشەیە؟**

وەڵام : کتێبەکانی مێژوو باسیان کردووە کاتێك خاچپەرستان دوای فەتحی قودس لە ساڵی 583ی کۆچی ئابڵوقەیان خستەسەر شاری عەککا موسڵمانان بەهۆی کەمی و نەبوونی خواردن و ئازوقەوە تووشی بەڵاو ناخۆشییەکی گەورە بووبوون ، صلاح الدین و ئەوانەشی کە لەگەڵی بوون کۆمەڵێك موجاهیدیان نارد بە چەند کەشتییەك کە لە کەشتی خاچپەرستان دەچوو ، هەروەها ڕیشیان تاشی و ئەو جلانەشیان لەبەرکرد کە کافرەکان لەبەریان کردبوو و خاچیان بەرزکردبۆوە لەسەر کەشتییەکانیان ، ئینجا کاتێك خاچپەرستان بینیانن وایانزانی کە

هەر لە خۆیانن ئیتر وازیان لێهێنان ، ئیتر توانیان بچنە ناو عەککاوە و ئەو شتانەیان بۆ دابین بکەن کە خەڵکی عەککا پێویستیان پێی بوو لە کاتی ئابڵوقەکەدا . جا بابەتی لەبەرکردنی جلی کافران و تاشینی ڕیش و لەبەرکردنی ئاڵتون و ئەو جۆرە شتانە لە پێویستیدا و لەکاتی جیهاددا هەروەکو لێرەدا هێنامان دروستە ،هەتتا ڕێپێدانی درۆ و گۆڕینی کەسایەتی خۆت و لەبەرکردنی ئاوریشم و ئەو جۆرە شتانە لە جیهاددا هاتووە و ڕێی پێدراوە ، هەرچییەکیش لە ڕەگەز و جۆری ئەو شتانە بێت دروستە و ڕێ پێدراوە ، هەروەها نمونەی ئەو جۆرە حەرامانەش شتە پێویستەکان ڕێی پێدەدەن . بەڵام بابەتی بەرز ڕاگرتنی خاچ و بت کە بە گەورە ڕاگرتنی بانگەوازە کوفرییەکانیانی تێدایە ئەوە دروستنییە ، لەبەرئەوەی ئەمەیان هیچ شتێك ڕێی پێنادات تەنهاوتەنها زۆرلێکردن نەبێت ، بەڵام هەندێك لە ئەهلی عیلم ڕێیان پێداوە و بەڵگەشیان هەیە ، لەوانە :

1- لەوانەیە تیایاندا بێت جیاوازی نەکات لە نێوان زۆرلێکردن و پێویستیدا ، ئینجا وای دادەنێت کە ئەوەی زۆرلێکردن حەڵاڵی دەکات پێویستیش حەڵاڵی دەکات .

2- فەرموودەی محمدی کوڕی مەسلەمە کاتێك کەعبی کوڕی ئەشرەفی کوشت .

3- فەرموودەی حەججاجی کوڕی عەللاط .

4- کاتێك کافران جەنگ لەگەڵ موسڵماناندا دەکەن و بەسەریاندا زاڵ دەبن ، دەکەونە کوشتن و گرتن و دەربەدەر کردنیان لە وڵاتەکانیان ، ئەمەش ئامانجی زۆرلێکردنە کە بەو جەنگ کردنیان موسڵمانانیان ناچار کردووە کە ئەو کارە بکەن ، زۆرلێکردنیش ڕێگە بە کوفرکردن دەدات ئەگەر باوەڕی لەناو دڵیدا چەسپابێت و نەلەقێت . ئەم بەڵگانەش خاڵی نییە لە ململانێ و گفتوگۆ کردن لەسەریان ، مەگەر بەڵگەی

چوارەم ، چونکە ئەگەر موسڵمانان بە ڕاستی کەوتنە ناو ئەو حاڵەتەوە و گەیشتنە ئاستێك کە زۆریان بۆ بێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی کوشتن و گرتن لەسەر موسڵمانان ئەوا دروستە و ڕێپێدراوە والله أعلم ، مەگەر ئەوەی بە شێوەیەکی تایبەتی ئەهلی عیلم فەتوایان لەسەر داوە لەکاتی ڕوودانیدا بە ڕیکخەرە شەرعییەکانی .والله أعلم .

**3/ پرسیار : لەسەر بنچینەی ئەوەی کە لە پرسیاری پێشوودا هات ، ئەگەر یەکێك نەیتوانی کێشەیەکی چارەسەر بکات مەگەر لە ڕێگەی دادگای طاغوتانەوە ئەمە پێویستییە ، پێویستیش ڕێگە بە حەرامکراوەکان دەدات نەك بە کافرکردنەکان ، ئەی ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە چۆنە ؟**

وەڵام : بە هیچ جۆرێك دروستنییە حوکم ببەیتەوە بۆلای طاغوت تەنهاوتەنها لەکاتی زۆر بۆهاتندا نەبێت ، چونکە کوفرە ، بەڵام هەندێ لە تەلەبەی عیلم وای دەبینن کە لێرەدا پێویستێتی ڕێی پێدەدات بەڵگەشیان فەرموودەی حەججاجی کوڕی عەلاطە ، هەروەها هەندێك لە ئەهلی عیلم پێوستیان لەناو زۆرلێکردندا داناوە ، هەروەکو لە وەڵامی پێشوودا وەڵاممان دایەوە ، ڕای پەسەندیش ئەوەیە کە دروست نییە ، بەڵام ئەگەر بەو جۆرە بەڵگانە تەئویلی بکات و بەری تەنگبووبێت پێویستی بەو شتە بێت بیکات، ئەوە کافر نابێت . والله أعلم .

**4/ پرسیار : ئیقامە حوججە (بەکوردی : بیانووبڕین) چۆن لەسەر خەڵك دەکرێت ؟ کێ دەبێت پێی هەڵبستێت ؟ داواکارین ڕوونکردنەوەیەکمان لەسەر ئەوە بدەیتێ .**

وەڵام : مەسەلەی بیانووبڕین و ئەوەی کە کێ دەبێت پێی هەڵبستێت و چۆنییەتی بیانووبڕین لەسەر کەسەکە و ئەو شتانەی کە پەیوەستە بەم بابەتەوە ، جیاوازیان هەیە بە جیاوازی بابەتەکان لەم ڕووانەوە :

یەکەم : ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە بنچینەی دینەوە کە تەوحید و شیرکە ، هەرکەسێك لەوە لابدات ئەوە کافرە ، جا بیانووی بڕابێت یان نا ، بەڵام لە دونیادا حوکمی بۆ دەرناکرێت کە بکوژرێت و حوکمی ئەوەشی نادرێت بەسەردا کەلە ڕۆژی دواییدا لە ئاگردایە ، مەگەر ئەو کەسەی کە بەڵگەکانی هەمووی بۆ ڕوونکراوەتەوە و بیانووی بڕاوە . بەڵگەش لە بنچینەی ئەم دینەدا تەنها گەیشتنی بەڵگەکەیە پێی ، جا هەر کەسێك دینی ئیسلام یان قورئان یان گوێی لە پێغەمبەر و ئەو جۆرە باسانە بووبێت ئەوە ئەو کەسە ئیقامە حوججەی لەسەر کراوە ، ئینجا چ لەڕێی موسڵمانەوە پێی گەیشتبێت یان لەڕێی کافرەوە وەکویەکە ، یان توانای هەبووبێت کە زانیاری لەسەر ئیسلام هەبێت بەڵام پشتی تێبکات ، ئا ئەمانە لە دنیا و دواڕۆژیشدا کافرن ، هیچ مەرجێکیشیان لەسەر دانانرێت بۆ بیانوو بڕینیان ، لەبەرئەوەشە کە گۆڕپەرستەکان لە وڵاتانی موسڵماندا کافرن لە دنیا و دواڕۆژدا ، ئەگەرچی هەر یەکێکیان لە کەرە ماڵییەکەی نەزانتربێت ، چونکە بەڵگەو نیشانەکەیان پێگەیشتووە کە ئیسلامە و قورئانیشیان لایە ، بەڵام خوا دڵی مۆر کردوون و هیچ شتێك تێناگەن ، خوا پشتیوانمان بێت . لە ابوهریرةوە بە صحیحی و بە مرفوعی هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی : والذي نفس محمد بیده ، لا یسمع بي أحد من هذه الأمة ،

يهودي ولا نصراني ، ثم يموت ولم يؤمن بالذي أرسلت به إلا كان من أصحاب النار . واته : سوێند بێت بەوەی کە گیانی محمدی بە دەستە ، هەر کەسێك لەم ئوممەتانە گوێی لە دەنگی من بێت ﴿واتە لە بانگەوازەکەی﴾ ، یەهودی بێت یان نەصرانی ، پاشان بمرێت و باوەڕی بەوە نەبێت کە بۆی نێردراوم ئەو کەسە لە خەڵکی ناو دۆزەخە . لێرەدا کۆمەڵە کەسێك دەبینیت کە بیانوویان لە بنچینەی دینەکەدا بڕاوە ، یان گوێیان بۆ ئیسلام گرتووە و بیستوویانە ، کە ئەمە ئیتر بەسە ، یان توانیویانە زانیاریان لەسەری دەستبکەوێت بەڵام نەیانکردووە و پشتیان تێکردووە ، هەردوو کۆمەڵەکەش بیانووبڕینیان لەسەر کراوە . والله أعلم .

دووەم : بریتیە لەو شتانەی کە پەیوەستن بە بەندایەتییە دیارەکانی ئیسلام ، وەکو واجبی چوار ڕوکنەکە ﴿نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج﴾ ، حەرامی زینا و مەی و ئەو جۆرە شتانە لە و باسانەن کە بە موتەواتری﴿واتە لە کۆمەڵێکی زۆر خەڵکەوە هاتوون﴾ هاتوون ، لەمەدا عوزر بە جەهل لەو کەسانە وەردەگیرێت کە توانای نییە زانیاری لەبارەیانەوە هەبێت ، وەکو ئەو کەسانەی کە تازە موسڵمان دەبن ، یان لە شوێنێکی دوور لە وڵاتانی موسڵمانان ژیابێت، ئەگەر ئەو کەسە بنچینەی دینەکەی لە خۆیدا بەجێ هێنابوو ﴿کە تەوحیدە و وازهێنانە لە شیرك﴾ ، بەڵام بۆ نمونە ئینکاری واجبی نوێژی دەکرد یان مەی بە حەڵاڵ دەزانی، هەروەها نەزانبوو بەم جۆرە شتانە ، ئەوە ئەو کەسە تەکفیر ناکرێت هەتا بیانووی نەبڕێت ، بیانووبڕینەکەش لێرەدا ئەوەیە کە ئەو کەسە بەڵگەکانی پێگەیشتبێت لەو مەسەلانەدا ، جا هەر کەسێك لەوانە بەڵگەی پێگەیشت ئەوە ئیتر بیانووی بڕاوە ، با ئەو کەسەشی کە بەڵگەکەی پێگەیاندووە موسڵمانێکی ئاسایی بێت و تەلەبەی زانستی شەرعیش نەبێت ، چونکە ئەم جۆرە باسانە دیارن و موتەواترن .

سێیەم : ئەو شتانەیە کە پەیوەستە بە مەسەلە شاراوەکانەوە و بێجگە لەوانیش چونکە بە گۆڕانی کات و شوێن و کەسەکان دەگۆڕێن ، بابەتەکانیش شوێنی جیاوازین ، شیخ الاسلام بە کۆمەڵێك لە جەهمییە حلولییەکانی فەرموو : لو قلت بقولكم كفرت ، و أنتم لا تكفرون عندي لجهلكم . واتە : ئەگەر من ئەو قسەیەی ئێوە بکەم کافر دەبم ، بەڵام ئێوە لەلای منەوە کافر ناکرێن چونکە نەزانن . یان هەروەکو لە ﴿الاستغاثة﴾دا فەرموویەتی ،

بەڵام زانایانی دەعوەی نەجدی ڕایان جیاوازبووە لەگەڵ ئەو قسەیەدا . مەبەستیش لێرەدا ئەوەیە کە جەهمییەکان دەیانوت ﴿خوا لە هەموو شوێنێکە﴾ ، شیخ الاسلام وای بینی کە خۆی دەبێت ئەو بابەتەیان بۆ ڕوون بکاتەوە لەبەر بەهێزی شوبهەکەیان و ئەوەش کە لەسەری دامەزراون ، بەڵام زانایانی دەعوەی نەجدی ڕایان جیاوازبووە لەگەڵ ئەو قسەیەدا هەروەکو پێشتر وتم ، لێکۆڵینەوەش لەو بابەتە دەگەڕێتەوە سەر یەك شت ئەویش بە درۆخستنەوەیە ، جا هەر کەسێك لە تأویلی ئەم بابەتانەدا بینی کە لە ڕاستییەکەوە دەیبەن بەرەو لادان و بەدرۆخستنەوە یان گفتوگۆی لەگەڵدا کردن و زانی کە دەقەکان بەدرۆدەخەنەوە ئەوە ئەو جۆرە کەسانە کافر دەکرێن ، بەڵام ئەگەر بینی کە دەقەکان بەدرۆناخەنەوە بەڵکو بە ڕاستی دەزانن ئەگەرچیش گۆڕانکارییان تێدا کردبێت ئەوە ئەم جۆرەیان کافر ناکرێن ، ئەمەش کورتەیەکی باسەکەبوو لەسەر ئەم بابەتە ئەگەرچی بابەتێکی ئاوها قسەی زۆر هەڵدەگرێت ، واللە أعلم .

دەبینین بیانووبڕین لەم سێ بەشەدا جیاوازن :

1- بنچینەی دین : بەس پێی گەیشتبێت یان گوێی لێبووبێت ئەگەرچیش کافر بێت .

2- بابەتە دیارەکان : گەیشتنی بەڵگە بەس لە بابەتەکاندا بۆ هەر موسڵمانێك .

3- بابەتە شاراوەکان : پێویستە لێرەدا گومانەکە بڕەوێنرێتەوە و دەربخرێت ، ئەمەش لەلایەن هەموو کەسێکەوە ناکرێت .

**5/ پرسیار : تأویل لە بابەتە دیارەکاندا زۆر قسەی لەسەر دەکرێت هەروەها زۆریش قسە لەسەر زەوابتەکانی دەکرێت ، بەڵگەش بە کارەکانی قودامە ﴿ڕەزای خوای لێبێت﴾ دەهێنرێتەوە ، لەگەڵ گێڕانەوەکانیدا ، ئەو زەوابتانە چین لە تأویلدا کە کەسەکە پۆزشی بۆ دەهێنرێتەوە تیایدا ؟**

وەڵام : پێشتر وەڵامی ئەوەم دایەوە ، ئەویش بەرپەرچدانەوە و بەدرۆخستنەوە یان ڕەددانەوەیەتی ، ئەگەر تأویلەکەی لێڵبوو و ڕوویەکی ئەوەی لیٚ دەخوێنرایەوە کە دەقەکان بەدرۆناخاتەوە یان ڕەدیان ناکاتەوە ئەوە ئەو کەسە کافر ناکرێت ، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوە بوو ، بەوەی کە بزانێت کەسەکە دەقەکان بە درۆدەخاتەوە یان ڕەدیان دەکاتەوە و پابەند نابێت پێیانەوە ئەوە لەم کاتەدا ئەو کەسە کافر دەکرێت .

**6/ پرسیار : بابەتی بەرزبوونەوە زیاتر لە هەزار بەڵگەی لەسەرە هەروەکو ابن القیم﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ فەرموویەتی ، ئایا ئەمە لەو بابەتە دیارانەیە کە بەسە بەوەی ئایەتی قورئانەکە بخوێنیتەوە لەگەڵ جیاوازی هەموو کۆمەڵە موبتەدیعەکان ؟ ئەگەر ئەمە دیار نەبێت ، چۆن دەبێت لە بابەتە شاراوەکان بێت کە ئەو هەموو دەقەی لەسەر هاتووە ؟**

وەڵام : کۆمەڵێك بابەت هەیە کە بەپێی کات و شوێن و بارەکان دەگۆڕێت ، وەکو هەندێك لە ئایەتەکانی صفات ، بنچینەکەش لەم بابەتەدا ئەمەیە : ئەگەر موبتەدیعەکە دەقەکانی بە درۆدەخستەوە یان ڕەددی دەکردنەوە ئەوە کافرە ، ئەگەرنا ئەوە کافر ناکرێت ، بۆ نمونە

دەقەکانی بەرزبوونەوە لەوەختی سەلەفدا دیاربوون ، لەبەرئەوە ئەو کەسەیان تەکفیر دەکرد کە نەفی بکردایە یان تأویلی بکردایە ، پاشان شاردرایەوە دوای ئەوەی کە شوبهە لەناو موسڵمانان‌دا بڵاوبۆوە لە دوای سەدە چاکەکان ، لەبەرئەوەیە کە دەبینین زۆرجار ئەو کەسانەن کە خۆیان داوەتە پاڵ زانست و دێن دەقەکان تأویل دەکەن ، بەدرۆی ناخاتەوە و ڕەددی ناکاتەوە ، بەڵام شوبهەیەکی لەلا دروستبووە کە لەلایەن ئەوانەی قسە دەکەن لەناو خەڵکدا بڵاوبۆتەوە ، ئینجا بابەتە دیارەکانیش هەموویان لە یەك ئاستدا نین ، هەروەکو چۆن بابەتە شاراوەکان لە یەك ئاست و پلەدا نین ، هەندێك بابەتی دیار شاردراوەتەوە ، بەپێچەوانەشەوە هەروایە. والله أعلم .

## **7/ پرسیار : مەبەست چییە لە تێگەیشتنی بەڵگە کە کەسەکە تیایدا بیانووبڕ دەکرێت ، ئەوەش کە پۆزشی بۆ ناهێنرێتەوە لە بابەتی بیانووبڕیندا؟**

وەڵام : مەبەست لە تێگەیشتن :

1- زانینی واتاکەی : ئەمە مەرجە .

2- زانینی واتای ڕاست و دروستی دەقەکە : ئەمەیان مەرج نییە .

بەڵگەش لە بنچینەی دیندا گەیشتنی بانگەوازە بەهەر شێوەیەك بێت ، بیانووبڕین لە بابەتە دیار و موتەواترەکاندا گەیشتنی بەڵگەیە بۆئەوانەی کە پۆزشیان وەردەگیرێت و لە بابەتە شاراوەکاندا دەرخستنی شوبهە و گومانەکەیە ، بەشی سێیەمیش ئەگەر یەکەم و دووەم نەبوون ئەوە سێیەمە . والله أعلم .

## 8/ پرسیار : مەبەست چییە لە تێنەگەیشتن لە بیانووبڕین؟

وەڵام : تێنەگەیشتن مەبەست لێی دوو شتە :

1- تێنەگەیشتن لە واتای وشەکان : ئەمە پۆزشە لە کاتی بیانووبڕیندا ، پێویستە ئەو کەسە لە واتای وشەکان تێبگات ، بۆنمونە وەکو ئەعجەمییەك ئەگەر وتاری بە زمانی عەرەبی بۆ بدرێت .

2- مۆری خوا لەسەر دڵی کافران و تێنەگەیشتنیان لە ڕاستی و دروستی ئەو واتایانە: ئەمەیان هەرگیزاوهەرگیز پۆزش نییە ، بەڵکو خوا سبحانە و تعالی مۆری ناوە بە دڵیانەوە و تێناگەن . لە ڕاشکاوانەترین بەڵگەکانیش فەرموودەی خوای تعالی یە کە دەفەرموێت : ولو علم الله فيهم خيرا لأسمعهم .واتە : ئەگەر خوا خێر و چاکەی تیا ببینیایانەیە وای لێدەکردن کە(وتە ڕاستەکان) ببیستن ، پاشان فەرموویەتی : ولو أسمعهم .واتە : ئەگەر واشیان لێبکەین کە ڕاستییەکانیان پێبگات ﴿لتولوا وهم معرضون﴾ پشت هەڵدەکەن و حەزی پێناکەن . جا ئایا هیچ قسەیەك هەیە لە فەرموودەی خوا ڕاستتربێت ؟! خوای تعالی باسی ئەوەی کردووە ئەگەر ئەو کافرە نەزانانە زاناش بن و بەدوای شتەکاندا بگەڕێن و لە ڕاستی ئەو باسە بکۆڵنەوە کە پێیان گەیشتووە هەر بەردەوام دەبن لەسەر کوفرەکەیان ، لەدوای ئەمە پێویست بە ڕوونکردنەوە دەکات؟! والله أعلم .

**9/ پرسیار : ئایا شێواندن و لێڵكردن پۆزشە لە بابەتەكانی شیرك و بنچینەی دیندا ؟**

وەڵام : شێواندن و لێڵكردن پۆزش نییە لە شیركی گەورەدا ، هەر كەسێك بكەوێتە ناو كوفرەوە بەبێ زۆرلێكردن ئەو كەسە كافرە ، زۆربەی كافرانیش كە كەوتوونەتە نا كوفرەوە بەهۆی لێ شێواندنیانەوە بووە لەلایەن گەورە و زاناكانیانەوە ، خوای تعالی دەفەرموێت : اتخذوا أحبارهم و رهبانهم أربابا من دون الله . واتە : حیبر﴿زاناكانی یەهود﴾ و ڕاهیبەكانیان﴿زاناكانی نەصارا﴾ دەكرد بەخوا ﴿واتە لە كارەكانیاندا قسەی حیبر و ڕاهیبەكانیان پێش قسەی خوا دەخست/وەرگێڕ﴾ لە جیاتی خوا . ئەمەش سەرزەنشت كردنیانە نەك پۆزش هێنانەوە بۆیان .خوای تعالی لەبارەیانەوە دەفەرموێت –كاتێك لە ئاگردان- : وقالوا ربّنا إنّا أطعنا سادتنا و كبرائنا فأضلونا السبیلا . واتە : و دەڵێن خوایە بەڕاستی ئێمە گوێڕایەڵی گەورە و پیاوماقوڵەكانمان دەكرد لەسەر ڕێگەكە گومڕایان كردین . خوای تعالی دەفەرموێت : ولو تری إذ الظالمون موقوفون عند ربهم یرجع بعضهم إلی بعض القول یقول الذین استضعفوا للذین استكبروا لولا أنتم لكنا مؤمنین...ئایەتەكان . واتە : خۆ ئەگەر دەبینی چۆن ستەمكاران وەستێنراون لەبەردەم خوای خۆیاندا قسە بەیەكتر دەڵێن و لاوازەكان بە گەورەكانیان دەڵێن ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئەوە ئێمە باوەڕدار دەبووین . زۆرێكی تریش لەو ئایەتانە ، هەروەكو لە فەرموودەیەكی بەربڵاویشدا هاتووە ، لە فەرموودەی عبدالله ی كوڕی عمرو ﴿ڕەزای خوا لە هەردووكیان بێت﴾ لەبارەی هەڵگرتنەوەی زانست ، كە بەشێوەیەكی لێوەی هاتووە ، لە بەشێكیدا دەفەرموێت : فاتخذ الناس رؤوسا جهالا ، فسئلوا فأفتوا بغیر علم ، فضلوا و أضلوا .واتە : خەڵكی كەسانێكی نەزان دەكەن بە دەمڕاستی خۆیان و پرسیاریان لێدەكەن ، ئەوانیش فەتوا دەدەن بەبێ ئەوەی زانستیان پێ بێت ، جا

خۆیان گومڕابوون و خەڵکیش لەگەڵ خۆیاندا گومڕا دەکەن . دەقەکانیش لەسەر ئەم باسە زۆرە ، ئینجا هەرکەسێکیش دەیەوێت پۆزش بە لێشێواندن بهێنێتەوە ، ئەوە دەبێت پۆزش بۆ هەرچی کافر هەیە بەبێ ئەوەی کەسیان لێدەربکات بهێنێتەوە ، چونکە هەموویان لەلایەن ئیبلیسەوە کەوتوونەتە ناو شێواندن و گومڕاکردنەوە ﴿وماكان لي عليكم من سلطان إلّا أن دعوتكم فاستجبتم لي فلا تلوموني ولوموا أنفسكم.واتە : شەیتان بە شوێنکەوتووانی دەڵێت: من هیچ دەسەڵاتێکم بەسەرتاندا نەبوو تەنها ئەوەنەبێت کە بانگم دەکردن بۆ لای خۆم و ئێوەش وەڵامتان دەدامەوە ، جا سەرزەنشتی من مەکەن و سەرزەنشتی خۆتان بکەن﴾ ، ئەوانەشی کە لەسەر ئەهلی زانست دانراون لەو موشریکانە ئەوانە شەیتانن (شەیتانە ئینسەکان) . والله المستعان .

**10/ پرسیار : ئێوە باستان کردووە کە کۆکن لەگەڵ ﴿الإبراهيمي﴾دا لەنامەیلکەکەیدا بەناوی ﴿وقد أمروا أن يكفروا به﴾ لە حوکمی گشتیدا ، ئایا ئەوە ڕاوبۆچوونتانە لەم بابەتەدا؟**

وەڵام : دەڵێم : پێویستە لە برایان کە دان بە بابەتە شەرعییەکاندا بنێن و بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە ، بەڵام تاکەتاکەی خەڵك پێویست نییە لەسەری قسەیان لەبارەوە بکات ، لەبەر چەند هۆیەك کە شاراوەنییە لەلات ، من لە ساڵی 1425ی کۆچییەوە ئامۆژگاری برایان دەکەم کە واز لە شەڕوناکۆکی نێوانیان بهێنن لەبارەی تاکەتاکەی خەڵکەوە ، بەدانانان بە بنچینە(اصول) و بنەماکاندا(قواعد) باسەکە ببڕیننەوە ، هەتا ئێستاش هەر لەسەر ئەم بۆچوونەم ، پێشتریش پێم وتی : لەبەرئەوە نییە کە تاکەتاکەی خەڵك کافر ناکرێت ، بەڵکو

لەبەر چەند هۆکارێکە کە پەیوەستە بە بەرژەوەندی بانگەوازەوە ، ئەویش چەند بنچینەیەکی شەرعی هەیە ، خوا سەرکەوتووت بکات .

## 11/ پرسیار : حوکمی ناوەندی گفتوگۆی ئایینەکان چییە ؟

وەڵام : ناوەندێکی مەلعونە ، هەڵوەشێنەرەوەی بنچینەی ئایینی ئیسلامە ، ڕووخێنەری وەلاء و بەرائە ، بەدرۆخستنەوەی ئەو دەقانەیە کە فەرمان دەکات بە دژایەتی کردنی کافران و بەرائەت کردن لێیان ، ڕەدکردنەوەی دەقەکانی جیهادی في سبيل الله يە ، جەنگکردنە لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه و سلم ، جا هەرکەسێك دایمەزراندبێت یان بەشداری تێدا کردبێت یان پێی ڕازی بووبێت ، ئەو کەسە کافرە و لە دین هەڵگەڕاوەتەوە ، لەعنەتی خواو فریشتەکان و خەڵکی لێبێت ، پێویستە بە هەموو شێوەیەك ئاگاداری بدەن لەبارەیەوە و هەموو ئەوانەشی کە بەشداری تێدا دەکەن ، چونکە ئەو طاغوتانە تەنها سەلامەتی گەورە و کاربەدەستەکانیان دەوێت ، ئەگەرچی هەرچی خەڵکیش هەیە فڕێی بدەنە ناو دۆزەخەوە . والله المستعان .

## 12/ پرسیار : ئایا شێواندن و لێڵکردن لەلایەن زاناکانەوە بە پۆزش دادەنرێت لە تەکفیر نەکردندا ؟

وەڵام : بابەتی پۆزش لە کوفردا قسەکردن لەبارەیەوە زۆر دوور و درێژە ، کتێبێکم لەبارەیەوە نووسیوە لە زیندان بە ناونیشانی : (التفصيل للعذر بالجهل و التأويل) ، ئەوەی کە پێکاویەتی ئەوەیە کە پۆزشی بۆ ناهێنرێتەوە لە دەستپێشخەری کردن لە کوفردا تەنها مەگەر ئەو کەسە زۆری لێکرابێت هەروەکو لە ئایەتدا هەیە ، ئینجا پۆزشەکانی تر ئەمانەن:

1- یان هەر لە بنچینەدا پۆزش نییە ، هەروەکو ئەوانەی کە کاتی خۆیان بەفیڕۆداوە لە بابەتی بیانووبڕیندا ، هەتا گۆڕپەرستەکان پۆزشیان وەربگیرێت بەهۆی نەزانییانەوە!

2- یان ئەو موسڵمانە هەر لە بنچینەدا نەکەوتۆتە ناو کوفرەوە ، وەکو بابەتی هەڵە و تأویل ، قسەکردنیش لە ڕوونکردنەوەی ئەمەدا درێژە و پێویستی بە یەك کتێبی تەواو هەیە ، ئەوەشی کە باسم کرد تەنها ئاماژەیەکە بۆ ئەو شتە .

ئەگەر ئەوەت زانی ، ئینجا قسە لەسەر شێواندنی زانا خراپەکان دەکەین لەسەر خەڵکی گشتی، ئایا ئەوە پۆزشە؟ دەڵێین ئەمە دەکرێت بە دوو بەشەوە :

یەکەم : ئەوەیە کە موسڵمان بۆخۆی بکەوێتە ناو کوفری کردارییەوە ، وەکو شەریك دانان بۆ خوا و هەروەها ، ئەمە پۆزشی تیانییە هەروەکو پێشتر باسم کرد ، تەنها مەگەر کەسەکە زۆری لێکرابێت ، ئەمما شێواندن لەلایەن زاناکان و فەتواکانیان بە هیچ جۆرێك کەسەکە پۆزشی بۆ ناهێنرێتەوە ، ئەگەر وانەبێت ئەوە پێویستە پۆزش بۆ ئەوانەش بهێنرێتەوە کە وتویانە : ﴿ربنا إننا أطعنا سادتنا و كبرائنا..الآية ، واتە : خوایە بەڕاستی ئێمە گوێڕایەڵی پیاوماقوڵ و گەورەکانمان دەکرد ..ئایەتەکە﴾ ، هەروەها پۆزشی ئەوانەش وەردەگیرا کە خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێت : ﴿اتخذوا أحبارهم ..الآية﴾ ، ئەوانەش پۆزشیان وەردەگیرا کە فەرموودەی صحیحیان لەبارەوە هاتووە لەباسی لێ سەندنەوەی زانست : فاتخذوا رؤوسا.. فەرموودەکە ، بێجگە لەوانەش .

دووەم : ئەوەیە کە موسڵمان نەکەوێتە ناوی و بزانێت کە ئەوە کوفرە ، بەڵام کافر ناکرێت بە کردارێکی لەبەر شوبهەیەك کە خستویانەتە بەردەمی ، وەکو شێواندنی ئەو زانایانە لەبەردەمیدا و هەروەها ، ئەمە کافر ناکرێت ، چونکە کرداری کوفری نەکردووە و دەق و

کۆدەنگی ڕەد نەکردۆتەوە ، ئەمەش لقێکە لە بابەتی (من لم یکفر الکافر فهو کافر . واتە : هەر کەسێك کافرێك کافر نەکات ئەوە خۆی کافر دەبێت) ،لەوەوە هەڵەیەکی زۆر پەیدا دەبێت ، لەبەرئەوە شتێکی کەمی لەبارەوە دەڵێم ، دەڵێم :

یەکەم : کافری بنەڕەتی ، بۆ نمونە وەکو جولەکە و گاوور ، ئەمانە هەرکەسێك کافریان نەکات ئەوە خۆی کافر دەبێت ، چونکە دەق و کۆدەنگی ڕەدکردۆتەوە .

دووەم : کافرێکی مورتەد ئەوەیە کە دانی بەوەداناوە وازی لە ئیسلام هێناوە دوای ئەوەی کە موسڵمان بووە ، یان بۆ دینێکی تر یان بۆ مولحیدی و ئەو جۆرە شتانە چووە ، ئەمەش وەکو بەشی یەکەم وایە .

سێیەم : کافرێکی مورتەد کە کەوتۆتە ناو یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام کە هەمووی لەسەری کۆکە ، وەکو گاڵتەکردن بە دین لەکاتێکدا بانگەشەش دەکات کە موسڵمانە ، جا هەرکەسێك واز لە تەکفیرکردنی بهێنێت ئەوە یەکێکە لەم دوو کەسە :

1- یان دانی پێدادەنێت کە قسە و کرداری ئەو کەسە کوفرە و دەق و کۆدەنگی لەسەر هاتووە ، بەڵام دەوەستێت لە تەکفیرکردنیدا لەبەرشوبهەیەك کە خستویانەتە بەردەمی، یان لەبەر خۆپاراستنێکی ساردوسڕ و هەروەها ، ئەمەیان کافر ناکرێت ، چونکە دەق و کۆدەنگی زانایانی ڕەد نەکردۆتەوە .

2- یان شتی دژبەیەك لە کردار و گوفتاریدا هەیە ، کە پێی وایە کوفر نییە ، ئەمەیان پێویستە بیانووی ببڕدرێت ، لەبەر ئەو دەق و کۆدەنگییانەی کە لەسەر ئەمە هاتووە ، ئینجا یان باوەڕ بەوە دەکات یان کافر دەکرێت .

چوارەم : کافرێکی مورتەد کە کەوتۆتە ناو یەکێك لەو هەڵوەشێنەرەوانەی کە ڕاجیایی لەسەرە ، بۆ نمونە وەکو وازهێنان لە نوێژ ، ئەمە ئەگەر کەسەکە واز بهێنێت لە تەکفیر کردنی ئەوە ئەو کەسە کافر ناکرێت (بەوەی کە نوێژنەکەرەکەی تەکفیر نەکردووە) .

**13/ پرسیار : ڕاتان چییە لەبارەی ئەو کەسانەوە کە دەڵێن پێویستە سەیری هەبوونی مەرجەکان و نەمانی ڕێگرەکان بکرێت بۆ ئەو کەسانەی کە کارێك دەکەن کە کوفرە ، وەکو شیرك یان جادوو یان گاڵتەکردن و ئەو جۆرە بابەتانە لە هەڵوەشێنەرەوەکان هەتا حوکم بدەین بە کوفری دەستنیشانکراو تیایدا ؟**

وەڵام : ئەمە ڕاست نییە ، سەیرکردنی مەرجەکان و ئەو شتانە لەو بابەتانەدایە کە شاراوەن ، بەڵام ئەو بابەتە بنچینەییانەی کە تۆ لە پرسیارەکەدا هێناوتە ، شیرك و جادوو و گاڵتەکردن و ئەو جۆرە بابەتانە ئەمەیان ئەو کەسەی بیکات کافر دەکرێت و هیچ ڕێزێکیشی نییە ، تەنهاوتەنها مەگەر کەسەکە زۆری لێ کرابێت ، بنەما و ڕێکخەرەکەش ئەوەیە : كل من قام به ماينافي الاستسلام لله فهو كافر ، إلا المكره فقط . واتە : هەرچییەك پێی هەڵبستێت کە دژ و پێچەوانەی تەسلیم بوون بێت بە خوا ئەوە ئەو کەسە کافرە ، تەنها ئەو کەسەی لێدەرچێت کە زۆری لێکراوە . حوکم بەم یاسایە بکە لەسەر هەموو باسەکان ، لەگەڵ ئەوەشدا تەسلیم بوون دوو شت لە خۆ دەگرێت :

یەکەم : تەسلیم ببێت بە خوا و بێجگە لەخوا ، ئەمەش شیرکە .

دووەم : تەسلیم نەبێت بە خوا ، کە ئەمەیان بەردۆخستنەوە و خۆ بە زلزانین و ئەو جۆرە شتانەیە .

ئەم دژو پێچەوانەیەش وەکویەکە ئەگەر لە یەك شتدا بێت یان زیاتر ، بۆ نمونە :

أ- هەرکەسێك بە نەزانی بەندایەتی بۆ غەیری خوا بکات = شیرکی ئەنجامداوە .

ب- هەرکەسێك بە نەزانی مەی حەڵاڵ بکات و نمونەی ئەو کەسە نەیزانێت = هەڵنەستاوە بە کردنی هەڵوەشێنەرەوەیەك .

ت- هەرکەسێك مەی حەڵاڵ بکات و نمونەی ئەو کەسەش نەزان نەبێت = هەستاوە بە بەدرۆخستنەوە یان ڕەدکردنەوە .

پ- هەرکەسێك تأویلی هەندێك لە سیفاتەکان بکات وەکو ئیستیواء و قودرەت بەهۆی شوبهەیەکەوە ﴿بەدرۆی نەخستبێتەوە و ڕەدی نەکردبێتەوە﴾ = وا هەژمار ناکرێت کە هەڵساوە بە کردنی شتێك پێچەوانەی ئیسلام بێت .

وەهەروەها هەموو باسەکان بەم شێوەیەن ، والله أعلم .

## 14/پرسیار : بەڵگە چییە لەسەر جیاکردنەوەی ئەم بابەتانە ﴿بنچینەی دین / ئاشکراکان / شاراوەکان﴾؟ لەگەڵ زانیاری سنوری هەریەکێکیان .

وەڵام : ئەم پرسیارە وەڵامەکەی پێویستی بە یەك نامیلکەی تەواو هەیە ، لێرەدا بە کورتی وەڵامت دەدەمەوە :

ئیسلام بریتیە لە بەتاك و تەنها تەسلیم بوون بۆ خوا ، دوو شتیش هەڵیدەوەشێنێتەوە :

یەکەم : ئەوەیە کە تەسلیم بیت بە خوا و غەیری خواش ، جا لە یەك جۆری بەندایەتی کردندا بێت یان زیاتر وەکو یەکە .

دووەم : تەسلیم نەبێت بەخوا وەکو ئەو کەسەی کە خۆبەزلزانە یان ڕێگرە و هەروەها ، جا لە حوکمێکی شەرعیدا بێت یان زیاتر وەکو یەکە .

هەرکەسێکیش تەواوی ئیسلام ڕەدبکاتەوە ئەوە مەبەستی پێی بنچینەی دینەکەیە . موشریکیش لە بنچینەدا موسڵمان نییە هەتا سەیری نیشانەکانی شیاوێتی کەسەکە بکرێت بۆ حوکمدان لەسەری .

ئەوانەشی کە ئیسلام ڕەدناکەنەوە مەگەر بەمەرجی ئەوەی کە پێی گەیشتبێت ئەمەش مەبەست لێی بابەتە ئاشکراکانە ، کە دووەمە . پێویستە لێکۆڵینەوە لەو خۆبەزلزانینە یان ڕەدکردنەوەیە یان بەدرۆخستنەوەیە و هەروەها بکرێت هەتا ناوی ئیسلامی لێبکرێتەوە ، ئەمەش بەدەست نایەت مەگەر بەوەی کە پێی گەیشتووە ، چونکە ئەگەر ئەو کەسە نەزان بێت بە بابەتەکە ئەوە هەر لە بنچینەدا شتێکی تیا دەرنەکەوتووە کە پێچەوانەی ئیسلام بێت، چونکە نەخۆی بەشت زانیوە نە بەدرۆشی خستۆتەوە .

بەڵام بابەتە شاراوەکان بەپێی شەرع و عەقڵیش جیاوازن لە بابەتە ئاشکراکان ، هەروەکو زانراوە ، پێویستە لە کوفری ئەو کەسانەدا شتێك بەدی بکرێت کە ئیسلام ڕەدبکاتەوە لە بەدرۆخستنەوە یان خۆبەزلزانینەوە ، ئەمەش جێبەجێ نابێت لەگەڵ شوبهە و تأویل کە لەلای دروستبووە ، ئەو کەسەش بەهۆی ئەوەوە نە خۆی بەزلزانیوە و نە بەدرۆخەرەوەشە ، بەڵام ئەگەر ئەو شوبهەیەی بۆ دەرکەوت لەسەر ڕووە ڕاستییەکەی و بیانووی لەو بارەیەوە بڕا بۆئەوەی لەدوای ئەوە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو خۆ بەزلزانین یان بەدرۆخستنەوەیەی ئەو کەسە بکات، ئەگەر کەسەکە هەر سووربوو لەسەر قسەکەی ئەوە ئەو کاتە کافر دەکرێت، ئەمانەش هەموویان زانراون بە خوێندنەوەی بەڵگە شەرعییەکان و قسەی زانایان . والله أعلم .

## 15/پرسیار : پێناسەی شیرکی بچوك چییە ؟

وەڵام : نووسینێکم لەسەر شیرکی بچوك هەیە ، ئەمەش پوختەکەیەتی :

زانایان ڕاجیاییان هەیە لە پێناسەکەیدا ، هەندێکیان بە ژمارە و بەبێ پلە بەندی پێناسەیان کردووە ، هەندێکیشیان بەشێوەیەك پێناسەیان کردووە کە وێنای زاراوەکانی ناکات ، هەروەکو ئەوەی کە شیخ لێرەدا باسی کردووە ﴿وەکو شیخ علي الخضير﴾ لە پێناسەی شیرکی بچوکدا بەسێ جۆر هێناویەتی بە ژمارە و بەسنور و هەروەها بە سنوریش خۆی .

هەوڵمدا پێناسەی شیرکی بچوك بکەم دوای ئەوەی کە تاکەتاکەی شیرکە بچوکەکانم کۆکردەوە ، بینیم کە لە سێ شتدا خۆیان دەبیننەوە :

1- شیرکی شاراوە وەکو ریایەکی بچوك .

2- شیرکی وتە : وەکو سوێندخواردن ، خوا و تۆش بیانەوێت ، ئەگەر خوا و تۆ نەبوونایە ، وەهەروەها .

3- شیرکی هۆکار ، وەکو ئەوەی کە شتێك بە هۆکار دابنێیت هۆکاریش نەبێت ، بۆنمونە شومێتی ، بارانبارین بەهۆی ئەستێرەوە ، چاوەزار و هەروەها .

لەبەرئەوە لەسەر بناغەی جۆرەکانی ، پێناسەی شیرکی بچوك ئەمەیە :

صرف الموحد شيئاً لغير الله مما يقدح في الإخلاص على غير سبيل العبادة .

تەرخانکردنی شتێك بۆ بێجگە لە خوا کە دەبێتە هۆی لەق کردنی ملکەچی و پاکوپوختی لەسەر غەیری ڕێگەی بەندایەتی .

ڕوونکردنەوەی پێناسەکە :

1- صرف الموحد : موشریکێك کە شیرکی گەورەی هەبێت لەگەڵ کافری لیَ دەردەچێت ، قسەکردنیش لەسەر بچوك لقێکە لەسەر جێگیری ئیسلام .

2- شیئاً لغیر الله : ئەو بەندایەتی و شتانەی لیَ دەردەچێت کە بۆ خوا دەکرێت .

3- مما یقدح في الإخلاص : ئەوانەی لیَ دەردەچێت کە نابێتە هۆی زیان گەیاندن بە پاکوپوختی و ملکەچی ، وەکو گێڕانەوەی هۆکاری ڕووданی شتەکان بۆ هۆکارە ڕاستییەکەیان . پاکوپوختی و ملکەچیش کرداری و زانستییە ، پاکوپوختی و ملکەچی کرداری : بریتیە لەو تەوحیدەی کە خوا سبحانە داوای لێکردووین بە وتە و بە کردار بەبیَ ڕیا ، پاکوپوختی و ملکەچی زانستیش : بەستراوە بە ربوبیەتەوە ، کە ئەویش بریتیە لە تەوحیدی خوا سبحانە و پاکوپوختی و ملکەچیشی لە هەڵسوڕاندندا، لەوانەش بەستنەوەی ڕووداوەکان بە هۆکارەکەی خۆیەوە ، جا هەرکەسێك هۆکارێك دابنێت کە خوا داینەنابێت ، ئەوە ئەو کەسە زیانی بە پاکوپوختی و ملکەچییەکەی گەیاندووە .

4- علی غیر سبیل العبادة : ئەمانەی لیَ دەردەچێت : 1/ بەندایەتییە تەواوەکان وەکو سەربڕین و نەزرکردن . 2/ شیرکی بچوك ئەگەر مەبەستت پێی بەندایەتی بوو .

### 16/ پرسیار : واتای دیموکراسی چییە؟ جیاوازی چییە لە نێوان ئەو و شورا و ڕاوێژدا؟ حوکمی چوونە ناو پەرلەمان چییە؟

وەڵام : دیموکراسی بریتیە لە حوکمی گەل ، ئەویش بەواتای ئەوەیە کە یاسادانان و حەڵاڵکردن و حەرامکردن بە دەست گەل خۆیەوەیەتی ، کۆن لە پێش زاییندا لە یۆنان

هەبووە، پاشان دوای شۆڕشی ئینگلیزی دواتر فەڕەنسی پێشکەوتووە ، هەتا گەیشتووە بەوەی کە ئێستا هەیە ، کە کوفری ڕاستەوخۆ و بێ پێچ و پەنایە ، چونکە حوکم کردن هەر بۆ خوای پاك و بێگەردی بێ شەریکە ، هەروەکو خوای تعالی دەفەرموێت : ولا يشرك في حكمه أحدا .واتە : و هیچ کەسێك هاوبەشی ناکات لە حوکم و بڕیاریدا ، زیاد لەوەی کە زینا جیاوازە لەگەڵ نیکاحدا ، دیموکراسیش ئەوەندە جیاوازە لەگەڵ ڕاوێژدا ، لەبەر چەند هۆیەك :

یەکەم : ڕاوێژ لە کاروبارە ئیجتیهادییەکاندایە کە دەقی ڕاستەوخۆی لەسەر نەهاتووە ، بەڵام ئەو شتانەی کە حوکم تیایدا دیار و ئاشکرایە هیچ ڕاوێژ پێکردنێکی تێدا نییە . بەڵام لە دیموکراسیدا بۆ هەموو شتێك ڕاوێژ هەیە بەبێ ئەوەی هیچی لێ دەربکەن .

دووەم : ڕاوێژ بەو کەسانە دەکرێت کە ئەهلی ڕاوڕاوێژ بن و بە دادپەروەر و چاك و دیندار ناسرا بن. بەڵام دیموکراسی بۆ کۆمەڵێکە کە گەل هەڵیبژاردوون بەپێی هەواوهەوەسی خۆیان و ئەوەی کە بەرژەوەندییان لەسەریەتی ، جا ئەگەر ئەو کەسانە لە هیچ و پووچترینی ناو خەڵك بن .

سێیەم :  بەپێی وتەی دروست حوکمی ڕاوێژ پێویست نییە لەسەری کە هەر دەبێت جێبەجێی بکرێت ، سەرکردەی دادپەروەریش پێویست ناکرێت لەسەری کە هەر دەبێت وەریبگرێت ئەگەر بەرژەوەندی لە پێچەوانەی ئەوەدا بینی، بەڵام لە دیموکراسیدا پێویست کراوە لەسەری.

چوارەم : لە ڕاوێژدا حوکمێك یان یاسایەك دەرناچێت کە لەسەر خەڵك فەرز بکرێت ، بەڵام لە دیموکراسیدا بەو شێوەیەیە .

بێجگە لەوانەش لە جیاوازییەکان . کۆمەڵە کتێبێکی زۆر و چاکیش لەوبارەیەوە هەن واباشترە بگەڕێینەوە سەریان .

چوونە ناو پەرلەمانیشەوە مونکەرێکی گەورەیە لە چەند ڕوویەکەوە :

أ- داننان بە حوکمی گەلی تێدایە ، چونکە پەرلەمان بریتیە لە سەرچاوەی تەشریعی کە یاسای لێوە دەردەچێت ، هەر بەچوونە ناوی ئەو کەسە دانی بە حاکمێك بێجگە لە خوا ناوە ،کە ئەمەش کوفرە ، ئەگەر بۆ نمونە ئەو پەرلەمانەش ئیسلامییەکان دەستیان بەسەردا گرتبێت و دەستورێکی ئیسلامییان دانابێت ، ئەمە بە هیچ شێوەیەك حوکمی خوا نییە ، بەڵکو حوکمی گەلە ، چونکە ئەگەر ئەندامانی پەرلەمان بگۆڕێن یاساکانیش لەگەڵیاندا دەگۆڕێن ، وەهەروەها ، ئەمە حوکم کردن نییە بە شەریعەت ، شەریعەت بە هێز حوکم دەکات ، هەرکەسێکیش لەناو خەڵکدا ڕەدی کردەوە بە شمشێر لێی دەدرێت و دەخرێتە ناو زبڵدانەوە ، سەیری ژمارەی هەڵبژێدراوان و ئەو کەسانەی لەگەڵیدان و ئەو کەسانەی پێچەوانەین ناکرێت .

ب- پێویستە بۆ داخڵبوون بۆ ناو پەرلەمان سوێند بخۆیت لەسەر ڕێزگرتن لە دەستور ، ئەو دەستورەش بنچینەکەی کوفرە چەندەها کوفری تێدایە کە هەر لە ژمارە نایەت ، ئەمە ڕێزگرتنەکەی کوفرە ، ئەی دەبێت سوێندخواردن لەسەری چۆن بێت!

ت- ئەوانەی کە پێیان دەوترێت ئیسلامی خۆیان لە زۆر شت داماڵیوە لە پێناوی گەیشتن بە پەرلەمان ، پاشان تەنها بەشێکی ئەو تەنازولەیان بەدەست نەهێناوەتەوە کە داویانە لە پێناویدا ، سەیری حاڵی ئەمڕۆمان بکە زۆر بە ڕوونی ئەمەت بۆ دەردەکەوێت .

شیخ احمد شاکر ﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ له عمدة التفسير دا لەژێر فەرموودەی خوای پەروەردگار﴿وشاورهم في الأمر﴾ آل عمران_الآية 159 ، وتەیەکی زۆر جوانی هەیە لە بەراوردکردن لە نێوان دیموکراسی و ڕاوێژدا و ڕەددانەوەی ئەوانەشی کە دیموکراسییان داناوە بە ڕاوێژ و ئەوانەش کە بانگەواز بۆ هەڵبژاردن دەکەن ، بگەڕێرەوە سەری چونکە بەڕاستی وتەیەکە پێویستە بە ئاوی ئاڵتون بنوسرێتەوە .

**17/ پرسیار : ئایا شەرع بخرێتە بەر گفتوگۆ یان حوکمکردن بە شەرع بخرێتە ناو دەنگدانەوە بە هەڵوەشێنرەوەیەك و دەرچوون لە میللەتی ئیسلام دادەنرێت؟ ئەگەر بشڵێت من باش دەزانم یان نیوە دڵنیاییەکم هەیە کە زۆربەی دەنگەکان بەلای بەڵێدا دەڕۆن .**

وەڵام : بەڵێ ، ئەمە حوکمی گەلە کە ناونراوە دیموکراسی ، بەری بوونی خۆمان ڕادەگەیەنین لەلای خوا لە دیموکراسی و هەرچی طاغوتیش هەیە ، ئەگەر وتیان هەموو گەل —نەك تەنها زۆرینەیان- دەنگی پێ دەدەن ئەوە دروستنییە ، ئەمە حوکمی خوا نییە ، بەڵکو حوکمی گەلە ، چونکە ئەوان حوکمیان لەسەر نەداوە لەبەرئەوەی کە حوکمی خوایە و پێویستی کردووە و شەرعییەتی پێداوە ، بەڵکو حوکمیان لەسەرداوە لەبەرئەوەی کە گەل دەیەوێت ، ئەگەر بێجگە لەوەشیان بوێت دەیکەن ، گومڕاییەکانی ئەوانەی کە لەسەر کاری ئیسلامی دامەزراون لەم بابەتەدا زۆرن ، ئینجا هیچیش پێویست ناکات ئەوەنەبێت کە بچیت سەیری ئەو فەرموودانە بکەیت کە لەسەر خەوارج هاتوون ، چۆنیش حوکم دراون لە دەرچوونیان لە ئیسلام و فەرمانکراوە بە کوشتنیان، سەرزەنشتییەکی زۆریش کراون لەگەڵ ئەو هەموو بەندایەتییە زۆرەیان و بە گەورەدانانی ئیسلام و شەرع و مەبەست و ئامانجیان بۆ چاکە ،

هۆی ئەوە چییە؟ لەبەرئەوەیە کە پەیڕەو و بەرنامەیەکیان گرتووە کە لە عەقڵی خۆیانەوە هێناویانەوە و بریتی نییە لە پەیڕەو و بەرنامەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و هاوەڵەکانی ، ئەی دەبێت حاڵی ئەو کەسانە چۆن بێت کە هیچ بەندایەتییەکیان نییە و شەرعی خوا بە گەورە ڕاناگرن وەکو ئەوەی کە لەلای خەوارجەکان هەبوو ، خەریکن لەهەرچی دەرگای کوفر هەیە دەدەن و دەچنە ناویەوە ، ئایا هیچ مەبەستێکی چاك تکایان بۆ دەکات ؟ قسەش لەسەر ئەم باسە درێژە ، والله المستعان .

**18/ پرسیار : ڕاستی بەڕێوەبەرایەتی تاوانەکان چییە؟ و حوکمی ئەو کسەش چییە کە حوکم دەباتەوە بۆلای بۆ وەرگرتنەوەی مافەکەی؟**

وەڵام : بەڕێوەبەرایەتی تاوانە یاساییەکان ، ئەگەر ئەو زانایانەشی لەسەر دابنێن کە ژیرەکان بەرچاو لێڵ ناکەن! دروستنییە حوکم بەریتەوە بۆ لای . والله أعلم .

**19/ پرسیار : ئەوکەسەی لەم فەرمانگانە کار دەکات (گومرگ ، هاتوچۆ ، شارەوانی) و سەرپەرشتی وەرگرتنی پارەی زەریبە و سەرپێچی دەکات یان ڕێی پێدەدات و ئەو جۆرە شتانە، حوکمی چییە؟**

وەڵام : برای بەڕێزم بزانە خەڵك لەم جۆرە بابەتانەدا دەکرێن بە سێ کۆمەڵەوە :

1- یاسادانەرەکان و حاکمەکان و دادوەرەکان : ئەمانە حوکمیان دیارە ، طاغوتن و حوکم بە غەیری ئەوە دەکەن کە خوا دایبەزاندووە .

2- ئەو ژێردەستانەی کە هیچ هێز و توانایەکیان نییە لە گۆڕین و نکوڵی کردندا : جا ئەمانە ئەصل تیایاندا پۆزشیان وەرگیراوە ، هەندێکیشیان تووشی تاوان دەبن بەپێی ڕازی بوونیان و نزیکی و دووریيان لێوەی .

3- ئەو فەرمانبەرانەی ئەو کارانە دەکەن کە باست کردووە : ئەوانە لە بەشی یەکەم دەچن لە ڕووی جێبەجێ کردنەوە ، لەڕووی ژێردەستەیی و بێ تواناییان لە دەرچوونیان لێی لە بەشی دووەم دەچن ، ئەوانە هیچ گومان نییە لە تاوان و کەوتنە ناو گوناهە گەورەکانەوە ، بەڵام لە بەستنەوەیان بە بەشی یەکەمەوە چاو پێداخشاندنەوەیەکی تێدایە ، لەبەر کۆمەڵێك جیاوازی . والله أعلم .

**20/ پرسیار : ڕەدی ئەو کەسانە چییە کە دەڵێن کۆمەڵی ڕێگر﴿الطائفة الممتنعة﴾ دوو قسەیان لەبارەوە هەیە؟ هەروەها ڕەدی گواستنەوەی کۆدەنگی لەوبارەیەوە لەلایەن شیخ الاسلامەوە ڕەد دەکاتەوە و دەڵێت : گەڕام بەدوای ئەو کۆدەنگییەدا هیچم نەبینی ؟ ئەی چۆن دەبێت کۆدەنگی هاوەڵانی لەسەربێت و لەدواییدا فەقیهەکان بێن و پێچەوانەی ئەو کۆدەنگییە بکەن لەکاتێکدا پێچەوانە کردنی کۆدەنگی کوفرە؟**

وەڵام : قسەکردن لەسەر کۆمەڵی ڕێگر بە کورتی لە دوو شوێندایە :

1- دەرهێنانی قسەکانیان .

2- هۆکاری کوفرەکەیان .

شوێنی یەکەم : کۆمەڵەکە ڕێگر بێت لە دروشمێك لە دروشمە دیارەکان ، دوو حوکمی هەیە :

أ- كوشتاريان : ئەمەش لەلای هەموو فەقیهەکان لە هەموو مەزهەبەکاندا کۆدەنگی هەیە.

ب- تەکفیرکردنیان : ئەمەیان لەلای فەقیهەکان دوو وتەی بەربڵاو هەیە ، بەڵام هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کۆدەنگن لەسەر کافری ئەو کۆمەڵە ، بەڵام کۆدەنگیان لەسەر ئەو بابەتە بەس قسە نییە ، بەڵکو جێگیرە بە خوێندنەوەی ژیانیان و سەیرکردنی کارەکانیان ، هەروەها فەقیهەکان هەرهەموویان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە هاوەڵان کۆدەنگبوون لەسەر کوشتاریان ، بەڵام جیاوازن لە دانانی حوکمەکە لەسەر ئەو بارو شوێنە : ئایا کوشتاریان بکرێت لەبەرئەوەی لە دین هەڵگەڕاونەتەوە یان لە ڕەگەزی کوشتاری یاخیبووانە؟ شیخ الإسلام لە چەند شوێنێکدا قسەی لەسەر ئەم بابەتە کردووە ، دانی بەوەداناوە کە لەبەرئەوە کوشتار دەکرێن چونکە لە دین هەڵگەڕاونەتەوە ، ئەمەش ڕووکەشی ئەو کارەی بوخارییە ﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ ، کە بەشێکی کردۆتەوە لەسەر فەرموودەی ئەبوهورەیرە ﴿خوای لێ ڕازی بێت﴾ لە کوشتاری ئەو کەسانەی کە زەکاتیان نەدەدا بەناوی ﴿باب قتال من أبی قبول الفرائض و ما نسبوا إلی الردة . واتە : بەشی کوشتاری ئەو کەسانەی کە فەرزەکان قبوڵ ناکەن و ئەوانەشی کە لە هەڵگەڕانەوەکان لە دین هەژمار دەکرێن﴾ ، بە هەڵگەڕاوە لە دینی داناون چونکە ڕازی نەبوون زەکات بدەن . ئەگەر ئەمە چەسپا ، بزانە کە شیخ کۆدەنگی فەقیهەکانی نەگواستۆتەوە لەسەر کافربوونیان ، بەڵکو کۆدەنگی فەقیهەکانی گواستۆتەوە لەسەر جەنگ کردن لەگەڵیان و کوشتاریان . ئەوەشی کەدیارە هاوەڵان لە چەندەها شوێندا قسەیان لەبارەوە هاتووە کە هاوڕابوون لەسەر

ئەوەی کە ئەوانە کەسانێکن لە دین هەڵگەڕاونەتەوە و ئەهلی ڕیددەن ، بەڵام ئەمە لە ڕێگەی دەرهێنانی حوکمەوە هاتووە نەك لە ڕێگەی دەرهێنانی دەقی ڕاستەوخۆوە لەلایەن هاوەڵانەوە ، لەبەرئەوە ئەو کارەی کە هاوەڵان بەڕاشکاوی و بێ پێچوپەنا و بەکرداری کۆدەنگن لەسەری جەنگکردنە لەگەڵیان کە هیچ فەقیهێك جیاوازی نییە لەگەڵیان ، بەڵام هۆکاری ئەو جەنگە و هۆی ڕوودانەکەی ڕاشکاو نییە هەروەکو پێشتر باسم کرد ، لەبەرئەوە جیاوازن تیایدا ، لەبەرئەمەیە بەو کەسەی کە دەڵێت نابێت کافر بکرێن ناوترێت پێچەوانەی کۆدەنگی زانایانی کردووە ، چونکە ئەمە لە کۆدەنگییەکدایە کە بڕابێتەوە ، بەڵام ئەوە بە دەرهێنانی حوکم جێگیربووە لە خوێندنەوەی کارەکانیانەوە ، ئەوەش گومانە .

شوێنی دووەمیش ، هۆکاری کافرکردنی کۆمەڵی ڕێگرە : بزانە دڵ دوو شتی هەیە ئەویش قسە و کردارە ، قسەی دڵ بە ڕاست زانینییەتی و کرداری دڵیش تەسلیمبوون و پابەندبوونە پێوەی ، هەرچییەك پێچەوانەی قسەی دڵ بێت ئەوە بەدرۆخستنەوەیە و هەرچییەکیش پێچەوانەی کرداری دڵ بێت ئەوە ڕێگرییە ، کە کوفرە و کەسەکە لە میللەتی ئیسلام دەچێتە دەرەوە . ئەگەر کەسێك حوکمەکە بەڕاست بزانێت ، بەڵام نەیکات و خۆی بە شت بزانێت لە بەرانبەر وەرگرتنی شتێك لەو دروشمە جێگیرە دیارانە ، ئەو کەسە بە دڵنیاییەوە تەکفیر دەکرێت . لەبەرئەوە هەرکەسێك واز لە نوێژ بهێنێت بە هۆی تەمەڵییەوە و بانگبکرێت بۆی بەڵام نەچێت بە دەنگییەوە و شمشێر خرایە سەری بەڵام هەر ڕەدی کردەوە ، ابن تيمية و ابن القيم فەتوایان داوە کە ئەو کەسە بە کۆدەنگی زانایان کافربووە ، ئەو کەسە لە دوو بار دەرناچێت یان بە درۆخەرەوەیە یان خۆبەزلزانە ، بە هیچ شێوەیەکیش دروستنییە بکەوێتە ناو

قسه و وته جیاوازەکانەوە . ابن تيمية باسی ئەو بابەتە دەکات و دەفەرموێت هەر کەسێك بڵێت وەکو موسڵمان دەکوژرێت ، ئەو کەسە کەوتۆتە ناو شوبهە و گومانی مورجیئەوە ، کە قسەیەکی درێژی لەو بارەیەوە هەیە ، هەروەها ئەو تاوانبارەی کە ئارەزووەکانی بەسەریدا زاڵ بووە ، دەشێت ڕێگر بێت لە وەرگرتنی حەرامەکان ئەگەرچیش بەڕاستی بزانێت ، ئەمەش بەزۆری لەوانەدا هەیە کە پێیان دەڵێن ڕۆشنبیرەکان! ، بۆیە دەیانبینیت خۆبەلزانی و ڕێگرییان تێدایە لە وەرگرتنی هەندێك لە فەرز و واجباتەکان ، وەکو جیهاد و فەرمان بە چاکە و هەروەها ، یان هەندێك لە حەرامکراوەکان وەکو سفوری ئافرەت و گۆرانی و بێجگە لەوانیش . تاوانباری خۆبەلزانیش کافرە ، مەگەر ئەو خۆبەزلزانی و ڕێگرییەی نهێنی بێت و نەتوانرێت بزانرێت ، لەبەرئەوەیە کە بنچینە لە تاوانباراندا کافر نەکردنیانە ، بەڵام کۆمەڵێك شتی لێ دەرکەوتووە کە ئاماژەن بۆ هەبوونی ئەو ڕێگرییەی ، ئەگەر دەرکەوت ئەوە بەوەی کە تیایەتی حوکم دەدرێت بەسەریدا . ئەگەر دانی بەوەدا نا بزانە کە دەرکەوتەیەکە لەسەر ڕێککەوتنی کۆمەڵێك لەسەر ئەوە ، چونکە نیشانەیەکە لەسەر خۆبەزلزانی و ڕێگرییان لە قبوڵکردنی شەرع ، ئەمەش هۆکاری کوفرەکەیانە . ڕێگری کردنیش لە وەرگرتنی شتێك لە شەرع جیاوازی نییە لە نێوان تاك و کۆمەڵدا ، بەڵام تاك هەروەکو پێشتر باسم کرد ناتوانرێت بزانرێت چی لە ناخیدا هەیە ، بنچینەش تیایدا ئیسلامەتییە ، جیاواز لە کۆمەڵ چونکە بۆنمونە هاوڕاییان لەسەر ڕەدکردنەوەی فەرزێك بەڵگەیە لەسەر ڕێگری کردن و خۆبەزلزانینیان لە بەرانبەریدا . والله أعلم .

**21/ پرسیار : ئایا دەتوانن ڕوونکردنەوەیەکمان بدەنێ لەسەر بابەتی خولانەوە(الطواف)؟**

وەڵام : خولانەوە دوو لایەنی هەیە ، مەبەست و شوێن ، خولانەوەی ڕێ پێدراو ئەوەیە کە بۆ خوای پاکوبێگەرد بێت و بە دەوری کەعبەدا بخولێتەوە . ئەمما خولانەوە بە دەوری غەیری کەعبەدا چەند بەشێکە :

1- ئەگەر لە هەر شوێنێکدا بخولێتەوە بۆ نزیك بوونەوە لە غەیری خوا ، ئەوە هیچ گومانێك نییە لە کافربوونیدا .

2- ئەگەر خولایەوە بە دەوری شوێنێکدا بێجگە لە کەعبە ، وەکو هەندێك شوێنی مەککە لە مینا یان عەرەفە یان موزدەلیفە ، یان بە دەوری مزگەوتی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم ، یان بە دەوری بيت المقدسدا وەهەروەها ، ئەگەر خولانەوەکەی بۆ خوا بێت ئەوە موبتەدیعێکی گومڕایە ، بەڵام تەکفیر ناکرێت ، بۆچی تەکفیر ناکرێت؟ ئەگەر وتت : چونکە خولانەوەی کردووە بۆ بێجگە لە خوا ، پێت دەوترێت : ئەو بۆ خوا خولانەوەی کردووە ، ئەگەر وتت : چونکە لە غەیری کەعبە خولاوەتەوە بە دەوری شوێنی تردا ، پێت دەوترێت : خولانەوە بۆ کەعبە نییە ، بەڵکو کەعبە شوێنێکە بۆ کردنی ئەو بەندایەتییە تیایدا ، لەبەرئەوە ئەو کەسە موبتەدیعێکی گومڕایە لە کارەکەیدا ، هەروەکو ئەوەی کە نوێژ بۆ خوای پاکوبێگەرد بکات لەو شوێنانەی کە نوێژکردن تیایدا نەهی لێکراوە یان لەو کاتانەدا کە نەهییان لێکراوە ، ئەوکەسە تەکفیر ناکرێت ، ئەگەرچی کارێکی نەهی لێکراوی کردووە و ئەو شوێنە شوێنی نوێژ نەبووە . ئەگەر بوترێت : خولانەوە دروستنییە تەنها لەیەك شوێندا نەبێت بە پێچەوانەی نوێژەوە ، دەوترێت : ئەم قسەیە لێرەدا لە شوێنی ئەوەیە کە خوای تعالى

ڕێگری لێکردووە ، هەروەك چۆن ڕێگری کردووە لە خولانەوە بەدەوری غەیری مزگەوتی حەرامدا ، هەرواش ڕێگری کردووە کە لە کات و شوێنە نەهی لێکراوەکاندا نوێژ بکەین .

3- ئەگەر بخولێتەوە بە دەوری گۆڕی یانماڵی یان...هتد ، پیاوچاکێك لە پیاوچاکەکان ، کێشەکە لێرەدایە ، چونکە نەخولاوەتەوە بە دەوری گۆڕی ئەو پیاوچاکەدا تەنها لەبەرئەوەی کە بە گەورەی گرتووە ، ئەم خولانەوەیە ئەگەر بشوترێت بۆ خوایە، باری کارەکە بۆ خۆی گوزارشت لەوە دەکات کە بە هیچ شێوەیەك بۆ خوا نییە ، بەڵکو بۆ نزیکبوونەوە و بە گەورەگرتنی ئەو پیاوچاکەیە ، وابزانم ئەم جۆرە بابەتەش بەڵگە نەویستە . لە ساڵی 1419ك چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ یەکێك لەو برا بەڕێزانە کرد ، بۆم باسکرد کە هەرکەسێك بخولێتەوە بەدەوری گۆڕدا ئەو کەسە موشریکە ، ئەو دانی بەوەدانا کە ئەو کەسە موبتەدیعە ئەگەر خولانەوەکەی بۆ خوا بێت ، پێم وت : وابزانم جیاوازییەکانمان هیچ بەرهەمێکی نییە ، چونکە من وای دادەنێم کە بەهیچ شێوەیەك کەسێك نابینیت بە دەوری گۆڕێکدا بخولێتەوە تەنها ئەو کەسە نەبێت کە تێوەگلاوە لە کۆمەڵێك شیرکیتر بەگوێیدا چرپێندراوە وەکو پاڕانەوە و نەزر و بێجگە لەوانەش ، ئەگەر کەسێکت بینی کە تەوحیدی بەتەواوی بەجێ هێناوە و تەبەڕڕای لە هەموو جۆرە شیرکێك کردووە ، هیچ شتێکی نەماوەتەوە تەنها ئەوەنەبێت کە بە دەوری گۆڕێکدا بخولێتەوە بۆ نزیکبوونەوە لە خوا ، لەوکاتەدا کۆتایی بە گفتوگۆکەمان دەهێنین ، کە هەرگیزاوهەرگیز شتی وا نابینیت ، والله أعلم .

**22/ پرسیار : لە فەرموودەی ﴿ذات أنواط : خاوەن دارەکان﴾دا ، ئایا هاوەڵان ﴿ڕەزای خوایان لێبێت﴾ کافربوون بەو قسەیە یان نا؟ و بۆچی؟**

وەڵام : کافر نەکران ، چونکە هەر لە بنچینەدا کارێکیان نەکردووە کوفر بێت بەڵکو ئەوە زیادەڕۆییە لە پرسیارکردن ، هەروەکو چۆن بەنی ئیسرائیل کافر نەکران بەو پرسیارەی کە کردیان ، بەڵکو زیادەڕۆیی لە پرسیارکردن تێدابوو . قسەکردنیش لەسەر ئەم بابەتە درێژە ، هەرگیزیش ئەمە نابێت بە بەڵگە بۆ پۆزش هێنانەوە بۆ ئەو کەسەی کە نازانێت ، بەڵکو بەتەواوی بە پێچەوانەی ئەوەوەیە . واللە أعلم .

**23/ پرسیار : ئایا کەسێك تازە هاتبێتە ناو ئیسلامەوە پۆزشی لێوەردەگیرێت ئەگەر کارێکی شیرکی ئەنجامدا یان کەوتە ناو هەڵوەشێنەرەوەیەکەوە وەکو سەجدە بردن بۆ بت لەناو وڵاتی ئیسلامدا؟ و ئایا دروستە لەسەر ئەوە بە بەڵگەی فەرموودەی ذات أنواط بهێنرێتەوە؟**

وەڵام : لە بنچینەی دیندا کەس پۆزشی بۆ ناهێنرێتەوە ، بیانووی ئەو کەسە دەبڕدرێت بە گەیشتنی بانگەوازەکە پێی ، بەڵکو پۆزش هێنانەوە لە شەرعەکاندایە وەکو نوێژ و حەرامی مەی و.. وە هەروەها ، ئەمما پێوانەکردنی بە فەرموودەی ذات أنواط بەتاڵە ، ئایا هاوەڵان کەوتبوونە چ شیرکێك یان کوفرێکەوە؟ هاوەڵان هەر لە بنچینەدا بەدەوری دارەکەدا نەخولاونەتەوە ، بەڵکو داوایان کرد ، ئەوەش زیادەڕۆیی کردنە لە پرسیار نەك کوفر ، کە دەکەوێتە ناو ڕەگەزی تاوان و سەرپێچییەوە ، ئینجا چۆن کەسێك سەجدە بۆ بتێك بەرێت لەسەر ئەوان دەپێورێت هەروەکو دەوترێت؟ واللە أعلم .

**24/ پرسیار : لە فەرموودەی صحیحدا هاتووە: هەر کەسێك بە براکەی بڵێت ئەی کافر ئەوە دەگەڕێتەوە سەر یەکێکیان ، ئایا ئەمە لە هەڵوەشێنەرەوەکانە؟**

وەڵام : تەکفیرکردنی موسڵمان وەکو ئەوەی کە بۆم دەرکەوتووە -والله أعلم- دەکرێت بە سێ بەشەوە :

یەکەم : ئەگەر کەسێك لە قسەکەیدا مەبەستی شتێکی تر بێت ئەوە هیچ گوناهی لەسەر نییە ، بەڵکو لەوانەیە پاداشتیشی بدرێتەوە هەروەکو زیاتر لە یەکێك دانیان بەوەدا ناوە ، وتەی عومەریش کە بە حاطبی وت بە بەڵگە دەهێنرێتەوە : دعني أضرب عنق هذا المنافق . واتە : لێم گەڕێ با لە گەردنی ئەم دووڕووە بدەم . هەروەها وتەی ئوسەید بۆ سەعدی کوڕی عوبادە : إنك منافق تجادل عن المنافقين . واتە : بەڕاستی تۆ دووڕوویت کە ئەوەندە دەمەقاڵێ لەگەڵ دووڕووەکاندا دەکەیت . وە هەروەها ، بوخاریش بەشێکی بۆ کردۆتەوە لە ئەدەبی موفرەددا بەناوی : باب من لم ير إكفار من قال ذلك متأولا أو جاهلا . واتە : بەشێك بۆ ئەوانەی کە کافربوونیان تێدا نابینرێت ئەگەر تأویلیان کردبێت یان نەزان بن .

دووەم : هەرکەسێك لەکاتی ستەم و دژایەتی و بوهتان کردندا ئەو شتەی وت و لە نەفسی خۆیدا ئەهلی تەوحیدبێت ، ئەو کەسە لەسەر هێڵی مەترسییە ، بەڵام والله أعلم ئەو کوفرە لەسەری ناکرێت بە کوفری گەورە ، بەڵکو دەکرێت بڵێین کەوتۆتە ناو گوناهێکی گەورە و کوفرێکی بچوکەوە ، ئەمەش بەگشتی ئەهلی عیلمی لەسەرە .

سێیەم : هەرکەسێك کەسێکیتر کافر بکات بەبێ تأویل و شوبهە ، ئا لێرەدا کافر دەکرێت چونکە باوەڕی بە کوفر داناوە ، لەسەر ئەوەش بوخاری بەشێکی کردۆتەوە بەناونیشانی : من

كفر أخاه بلا تأويل فهو كما قال . واته : هەر كەسێك برا موسڵمانەكەی كافر بكات بەبێ تأويل هەر ئەوەيە كە خۆی وتويەتی . ئەم دەقەشی تێدا هێناوە : من قال لأخيه ... .
ئاگاداربوون : جياوازی نێوان يەكەم و دووەم ئەوەيە كە يەكەم بە تأويلی شەرعی و بە بەڵگە هێنانەوە بە قورئان و فەرموودە تأويلی كردووە و لە بەشی هەستان لەپێناوی خوادا و فەرمان كردن بە چاكەدايە ، بەڵام دووەم بە تأويلێكی ناشەرعی تأويلی كردووە ، ئەگەرچی بەڵگەش بە شەرع بهێنێتەوە لە بەشی دژايەتی و ستەم و سەرخستنی نەفس ، والله أعلم .

## 25/ پرسيار : شيكردنەوەی هەڵوەشێنەرەوەی سێيەم چييە ﴿من لم يكفر المشركين أو شك في كفرهم...﴾؟

وەڵام : شيكردنەوەكەی دەكرێت بە چوار بەشەوە :
يەكەم : هەر كەسێك كوفرەكەی لە ڕەگوڕيشەوە بێت وەكو گاوور و جوولەكە : هەر كەسێك كافريان نەكات يان بوەستێت لە تەكفير كردنياندا ، ئەو كەسە كافرە چونكە كوفری نەكردووە بە طاغوت ، تەوحيديش پێويستە ئەم دوو شتەی تێدا بێت : كوفر كردن بە طاغوت و باوەڕهێنان بە خوا .
دووەم : هەر كەسێك لە دينی ئيسلام هەڵگەڕێتەوە و دان بە وازهێنانەكەيدا بنێت و ببێت بە جوولەكە يان بێ دين يان هەرشتێكی تر : ئەو كەسە هەروەكو بەشی يەكەمە .
سێيەم : هەركەسێك هەڵگەڕێتەوە لە دينی ئيسلام بە هەڵوەشێنەرەوەيەك كە هەمووی لەسەری هاوڕايە وەكو جنێودان بەڵام هەر بانگەشەی ئەوە بكات كە موسڵمانە : ئەگەر

کەسەکە دانینا بەوەدا کە ئەو قسەیە یان ئەو کردارە کوفرە بەڵام وەستا لە بە کافر دانانیدا ، ئەو کەسە کافر ناکرێت چونکە دەق یان کۆدەنگی ڕەد نەکردۆتەوە .

چوارەم : هەرکەسێك بە هەڵوەشێنەرەوەیەك لەو هەڵوەشێنەرەوانەی کە جیاوازییان لەسەرە لە دین هەڵگەڕێتەوە وەکو واز هێنان لە نوێژ : ئەگەر کەسێك ئەو کەسە کافر نەکات تەکفیر ناکرێت ، ئەگەرچی ناکۆکیش بێت لە بنچینەی بابەتەکەدا ، چونکە بابەتە بابەتێکی خیلافییە (واتە زاناکان ڕاجیان لەسەری/وەرگێڕ) . واللە أعلم .

## 26/ پرسیار : ئایا ئەو کەسەی کە یەك نوێژ تەرك دەکات کافر دەکرێت؟

وەڵام : ئەوەی بۆم دەرکەوتووە واللە أعلم نوێژنەکەر تەکفیر ناکرێت هەتا جوان وەسفی نوێژنەکەری لەسەر جێبەجێ نەبێت ، واتە تەرککردنی نوێژەکانی زیاتر بێت لە کردنەکانی ، هەرکەسێك واز لە نوێژێك یان چەند نوێژێك بهێنێت ، ئەو کەسە ئەگەرچیش کارەکەی لە گوناهە گەورەکانە ، بەڵام کافر ناکرێت ئەگەر نوێژەکانی لە زۆربەی کاتەکاندا بەجێ بهێنێت، هەشمانە لە ئەهلی عیلم کە ئەو کەسەی تەکفیر کردووە کە واز لە تەنها یەك نوێژ دەهێنێت ، گێرانەوەیەکیشە لە ئیمامی ئەحمەدەوە ڕەحمەتی خوای لێبێت . واللە أعلم .

## 27/ پرسیار : تەتار و قسەی شیخ الإسلام لەبارەیانەوە زۆر کێشەی بۆ دروستکردووم ، ئایا حوکمی بە کافربوونیان داوە؟

وەڵام : تەتارەکان ئەوانەی کە لەگەڵ موسڵمانانندا دەجەنگان ، شیخ الإسلام ﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ تەکفیری کردوون و ئەمەش بەڕوونی لە فەتوا و بەڵگە و کارەکانیدا دیارە. واللە أعلم.

**28/ پرسیار : خوا بتانپارێزێت دەتوانیت بە کورتی بابەتی بیانووبڕینمان بۆ باس بکەیتەوە؟**

وەڵام : بیانووبڕین لەسەر سێ وتە جیاوازی لەسەرە :

1- کەسێك بە تەواوی و بە ڕەهایی پۆزش بۆ کەسێك بهێنێتەوە کە نەزانە .

2- کەسێك بە هیچ شێوەیەك پۆزشی نەزانین لە کەس قبوڵ نەکات لە تەوحیددا (بنچینەی بەندایەتی) ، جا لە ناوەکانی دونیا بێت یان لە حوکمەکانی دوارِۆژ بێت ، بە هەتاهەتایی لە دۆزەخدا دایبنێت ئەگەرچی بانگەوازیشی پێنەگەیشتبێت ، بەڵگە بە بەڵێنی یەکەم دەهێنێتەوە .

3- سێیەمیان کە ئەمەیان پێکاویەتی : نەزانین هەیە پۆزشی لێوەردەگیرێت هەشە پۆزشی لێوەرناگیرێت :

أ/ دەبێت بە پۆزش بۆی لە بابەتە شاراوەکاندا وەکو قەدەر و باوەڕ و صیفات و نمونەی حوکمە کردارییە دیارەکان بێجگە لە تەوحید وەکو نوێژ و زەکات و حەرامی مەی و هەروەها.

ب/ پۆزش لە تەوحیدی بەندایەتیدا نییە ، کە ئەمەش بنچینەی دینی ئیسلام و دینی پێغەمبەران هەموویانە ، وەکو پاڕانەوە و سەربڕین و نەزر و هەروەها . پاشان نمونەی ئەم نەزانانە دابەش دەبن بۆ دوو بەش :

- نەزانێکی پۆزش وەرنەگیراو لە دونیا و دوارِۆژدا : بە واتای ئەوەی کە بە هەتاهەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە پەنا بەخوا دەگرم لەوانە ، ئەوەیە کە بیانووی براوە بە گەیشتنی بانگەوازەکە پێی ، وەکو داوای کردبێت و تێی نەگەیشتبێت -تێگەیشتن ڕاستبوونە لەگەڵی نەك هەست پێ کردن- یان پشتی تێکردبێت و نەیویستبێت .

- نەزانێکی پۆزش وەرگیراو لە دواڕۆژدا بە بێ دنیا : ئەو کەسەیە کە بیانووبڕینی لەسەر نەکراوە ، وەکو ئەو کەسەی کە لە دەشتێکی دوورەدەست یان لەناوچەیەکی شاخاوی چەپەك و سەختدا گەورەبووە ، یان لە ئەهلی فەترەیە ﴿ئەهلی فەترە : ئەوانەن کە دەمرن و بانگەوازی ئیسلامیان لە دوور و نزیکەوە پێنەگەیشتووە./وەرگێڕ﴾ وە هەروەها ، ئەمە لە دونیا وەکو موشریك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت ، بەڵام لە دواڕۆژدا کاری دەچێتەوە لای خوا ، ڕاسترین شتیش کە لەبارەی ئەوانەوە هاتووە ئەوەیە کە دەخرێتە ژێر تاقیکردنەوەوە. والله أعلم .

## 29/ پرسیار : ئایا گەیشتنی بەڵگە مەرجێکە لە مەرجەکانی حوکمی تەکفیر؟

وەڵام : کوفر دوو جۆرە بەپێی وتنی :

1- بە واتای کوفری گشتی دەردەبڕێت : ئەمەش هەر کەسێك دەگرێتەوە کە باوەڕی بە دینی ئیسلام نەبێت ، جا بیانووی لەسەر بڕابێت یان نا .

2- بە واتای کوفری تایبەتیش دەردەبڕێت : بریتیە لەوەی کە نکوڵی لە حەق بکات و ڕەددی بکاتەوە دوای ئەوەی کە پێی گەیشتووە ، ئەمەش تایبەتە بەوانەی کە بیانووبڕینیان لەسەر کراوە ، ئەوانە ئەگەرچی پێیان دەوترێت کافر بەڵام سزا نادرێن هەتا دوای بیانوو بڕینیان ، لەمەوە دەتوانرێت تەفسیری ئەو وتەیەی پێشەوا محمد(مەبەستی شیخ ناصر محمدی کوڕی عبدالوهابە/وەرگێڕ) بکەیت ﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ لەبارەی تەکفیر نەکردنی ئەوانەی کە گۆڕ یان عبدالقادر و بێجگە لەوانیش دەپەرستن بەهۆی نەزانییانەوە،

چونکە بەوە کوفری تایبەتی خاوەن مەرجی دەوێت بە بیانووبڕینەکە ، نەك کوفری گشتی کە بەرانبەرەکەی ئیسلامەتییە .

**30/ پرسیار : کەسانێك هەن کە دەڵێن ئەو کەسەی کە سەرەتا دەچێتە پەرلەمانەوە کافر نابێت ، چونکە چۆتە ناوی بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی لە کوفر کردبێت ؟**

وەڵام : ئەمە ئەستەمە ، چونکە پەرلەمان بۆخۆی ئەنجومەنی شەرعدانانە ، دامەزراندنیش لەسەری ئەو کەسە وەکو شەرع دانەرێك لە جیاتی خوا دادەنێت ، هەروەکو چۆن سوێند دەخوات لەسەر ڕێزگرتنی دەستور ، جا چۆن دەچێتە ناوی و هیچ شتێك لە کوفر پێشکەش ناکات؟!

**31/ پرسیار : جیاکردنەوەی گشتی و تاك ، بۆ نمونە : کۆمەڵەی فلان کافرن بەبێ ئەوەی دەست بخرێتە سەر تاکەکان ، ئایا ئەمە بنچینەی هەیە ؟**

وەڵام : بنچینە ئەوەیە هەرکەسێك کەوتە ناو کوفرەوە ئەو کەسە کافرە ، بابەتی جیاکردنەوەی گشتی و تاك لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئیرجاء ئەویش بڵاوبۆوە ، ئیرجائیش لەوانەیە بە گەڕاندنەوەی کوفر کردن بە خوا بۆ بیروباوەڕ بێت ، لەوانەشە بە دانەنانی حوکمەکە بێت لەسەر تاکەکان ، هەروەکو ئێستا دەیبینین ، هەتا هەندێك لەوانەی کە بە پێی کات و شوێن دەگۆڕێن وتویانە : لەسەر قسەی ئەوانە کەس ناچێتە ئاگرەوە تەنها کوفر نەبێت ، چونکە هیچ کافرێك نییە!! . ئەمەش مانای ئەوەنییە حساب بۆ مەرج و ڕێگرییەکان نەکەین ، بەڵام نەك بەو وێنەیەی ئێستا کە هەیە ، گەورەترین بەڵگەش لەسەری جەنگی ڕیددەیە ، ئامۆژگاریشت دەکەم بە خوێندنەوەی نامیلکەی شیخ ئیسحاق بن عبدالرحمن لە پێشەوایانی بانگەواز- لە

تەکفیری تاك و پۆزش بۆ هێنانەوە بە نەزانین ، بەرپەرچی هەموو ئەوانەی داوەتەوە کە دەڵێن کارەکە کوفرە بەڵام بکەرەکەی تەکفیر ناکرێت ، والله أعلم .

## 32/ پرسیار : شوێنەکان بۆ چەند شوێن دابەش دەکرێن؟ ڕێکخەری ئەو دابەشکردنە چییە؟

وەڵام : شوێنەکان وەکو ئەوەی کە زانراوە سێن :

- وڵاتی ئیسلام (دار الإسلام) : بریتیە لەو شوێنەی کە بە شەرع حوکمی تێدا دەکرێت .
- وڵاتی پەیمان(دار عهد) : وڵاتی کوفرە و بریتیە لەو شوێنەی کە لە نێوان ئەو و موسڵماناندا پەیماننامەیەك هەیە ، وەکو مەککە لە دوای ڕێککەوتننامەی حودەیبیە .
- وڵاتی جەنگ (دار حرب) : بریتیە لەو وڵاتە کوفرییەی کە لە نێوان ئەو و موسڵماناندا هیچ پەیماننامەیەك نییە .

ابن تیمیەش وتەیەکی هەیە لەبارەی وڵاتی تێکەڵ(الدار المرکبة) ، ئەو وڵاتەیە کە موسڵمانان و کافرانی تێدایە ، نە حوکمی ئیسلامی بەسەردا زاڵە نە کوفر ، جا هەریەکەیان بە پێی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و یەك حوکم نادرێت ، کە ئەمەش بنچینەکەیە ، لە ڕاستیدا دەبێت ئێستا سەیری وڵاتەکان بکرێت بەپێی ئەوەی کە ئێستا هەیە ، چونکە کاروبارەکانی ئەمڕۆ هەمووی تێکەڵبوون ، وڵاتەکان دەبینیت بەپێی حوکمکردنیان هەمووی وڵاتی کوفرن(دار کفر) ، بەڵام بەپێی تاکەکان جیاوازن ، تیایدا هەیە وڵاتی کوفر و وڵاتی ئیسلامە ، زۆربەی هەرەزۆریشی لە وڵاتە تێکەڵەکانن ، بەڵام وڵاتی پەیمان لەم زەمانەدا بوونی نییە ، ئەم بابەتەش درێژە . والله أعلم .

## 33/ پرسیار : حوکمی سەجدە بردن بۆ بێجگە لە خوا چییە؟

وەڵام : لە شەرعی ئێمەدا سەجدە بردن بۆ بێجگە لە خوا دوو قسەی لەسەرە :

یەکەم : شیرکی تەواوە .

دووەم : جیاکردنەوە لە نێوان سەجدەی ڕێز و سەجدەی بەندایەتی ، ئەگەر مەبەستی یەکەم بێت کە بۆ گەورەیەك یان سەرکردەیەك یان شتێك لەو بابەتانە سەجدە ببات ، ئەوە حەرامە و شیرك نییە ، بەڵام ئەگەر سەجدە بۆ دار یان بەرد یان گۆڕ یان بتێك ببات یان سەجدە بۆ گەورەکەی ببات بە نییەتی ملکەچی و بەندایەتی ، یان شەرع دابنێت ئەو کارە شیرك یان کوفری گەورەیە . بەڵگەش لەسەر ئەو جیاکردنەوەیە ئەوەیە کە لە سەجدەی فریشتەکان بۆ ئادەم جێگیر بووە ، هەروەها سەجدەی براکانی یوسف بۆ یوسف و هەروەها لەو دەقانە ، ناشوترێت ئەمە شەرعی پێش ئێمە بووە ، چونکە پێغەمبەران هەموویان کۆك بوون لەسەر تەوحید ، ئەگەرچی لەناوەوەی شەرعەکانیاندا جیاوازی هەبووە ، بەڵام بۆ ئەم ئوممەتەی ئێمە حەرام کراوە بەهۆی تەواوی و بێ کەموکوڕییەوە ، وابزانم ابن تیمیەش ئەو دوو شتەی لەیەك جیاکردۆتەوە .

من پێشتر لەسەر ڕای یەکەم بووم کە هەمووی شیرکە ، بەڵام کە لە بەڵگەکان وردبوومەوە لایدام بەلای وتەی دووەمدا . واللە أعلم .

**34/ پرسیار : ئایا ئەو یاسایانەی کە لەناو یارییەکاندایە دەچێتە ناو حوکمکردن بە غەیری ئەوەی کە خوا دایبەزاندووە؟ ئەگەر دەچێت حوکمی ئەو کەسانە چییە کە نمایش دەکەن و ڕاهێنانی لەسەر دەکەن و پێی ڕازین ، هەروەها حوکمی ئەو دادوەرانە چین کە تیایدان؟**

وەڵام : بنەماکە ئەوەیە کە هەرکەسێك حوکمی نێوان دوو کەس بکات هەتا ئەگەر منداڵیش بن لە پەت ڕاکێشان و هاویشتن ئەو کەسە دادوەرە هەروەکو هاوەڵان لەسەری بوون و ئەهلی عیلم گواستوویانەتەوە وەکو شیخ الإسلام و پێشەوایانی بانگەواز﴿شیخ ناصر مەبەستی پێشەوایانی بانگەوازی نەجدییە/وەرگێر﴾ ، لەبەرئەوە دروستنییە بۆ هیچ حاکمێك کاتێك داوەری دەکات مەگەر بە حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم نەبێت ، بگەڕێرەوە سەر قسەی شیخ الإسلام لە فتاوی لە بەرگی کۆتاییدا و لە شیکردنەوەی فەرموودەی أبوزەر لە سیاسەتی شەرعیدا کە دانی بەو کارەدا ناوە و لە هاوەڵانەوە گواستوویەتییەوە ، هەرئەوەشە کە دەقەکان بەڵگەن لەسەری . ئەگەر بەوە ڕازی بوو بزانە کە ئەو داوەرە لە یارییەکەدا بڕیاردەرە و بە غەیری ئەوەش داوەری دەکات کە خوا دایبەزاندووە ، حوکم بە یاساکانی فیفا دەکات لەعنەتی خوایان لێبێت ، لە نمونەی ئەوانەش ئەگەر یارزانێك لە یەکێکیتر بدات لە شەرعدا حوکمی دەدرێت بە تۆڵەکردنەوە ، بەڵام لە حوکمی ئەواندا کارتی سووری بۆ دەردەهێنرێت ، حوکمکردنیش بە غەیری ئەوەی کە خوا دایبەزاندووە کوفرە، ئەمەش لەو شتانەیە کە چاکی تێدا دەبێت بە خراپ و خراپی تێدا دەبێت بە چاك .

والله المستعان .

**35/ پرسیار : لە بەشە دیارەکانی حوکم کردن بە غەیری ئەوەی کە خوا دایبەزاندووە بریتیە لە  حاکمێك کە پابەندە بە حوکمی خواوە بە ئاشکرا و بە نهێنیش ، بەڵام لە بابەتێکی دیاریکراودا حوکم بە هەوا و هەوەسی خۆی دەکات ، وەکو ئەوەی زانراوە جارێك یان دوو جار کافر ناکرێت ، هەر ئەوەشە کە ڕێبازی پێشینە . ئایا ئەمە ڕاستە؟ ئەی حوکمی ئەو کەسانە چییە کە حوکم دەدات بە کفر کردنیان لە بابەتی بچوکدا؟**

وەڵام : ئەم بابەتە لای زۆربەی برایان جێگیربووە هەتا وای لێهاتووە مورجیئەکان بەسەریاندا زاڵبوون ، هەر لەوەوە چاوپێکەوتنێك لە شریتی نێوان : (...)﴿ژمارە و ناوی شریتەکە نەهاتووە/وەرگێڕ﴾ و لە کۆتاییدا ئەوە هاتووە کە کەسێك حاکمێك بە کافر بزانێت کە حوکم بە غەیری ئەوە دەکات کە خوا دایبەزاندووە ، پرسیاری لێدەکات(...)﴿ناوەکە نەهاتووە/وەرگێڕ﴾ ئەگەر لە کێشەیەکدا حوکم بکات ؟ ئەویش وەڵام دەداتەوە کە : کافر ناکرێت ، دوای دەڵێت : ئەی دوو کێشە؟ وەڵامدەداتەوە و دەڵێت : کافر ناکرێت ، ئینجا وردەوردە شتی بۆ زیاد دەکات هەتا ڕووگیری دەکات ، پاشان پێی دەڵێت : باشە ژمارەی ئەوانەم بدەرێ کە دوای ئەو حوکم کردنە دەچنە ناو کوفرەوە؟ ئیتر پرسیار لێکراو نەیتوانی وەڵامی بداتەوە ، مورجیئەکەش ئەم قسانەی بە قسەیەکی جەرگبڕ هەژمارکرد! کە لە ڕاستیشدا قسەکانی پووچ و باطل بوون .

پوختەی قسەش لەسەر ئەم جۆرە حاکمانە دوو بەشە :

یەکەم : ئەوەی کە لە هەموو کارەکانیدا بۆ شەرع بگەڕێتەوە ، بەڵام لە هەندێك دۆسیەدا بە هەواو هەوەسی خۆی حوکم بکات ، نەك بە شەرع ، بەو مانایەی بۆ نمونە دادپەروەری شاهید لەکەدار بکات لە کاتێکدا شاهیدەکان ڕاستگۆ و دادپەروەر بن ، یان گومان بخاتە ئەو

مەرجانەوە کە هەیە ، یان ڕێگرییەك باس بکات کە بوونی نییە و هەروەها ، ئەم حاکمە کارەکانی لە ڕووی دەرەوە هەمووی لە ڕووی شەرعەوەیە ، لە ڕوووی ناوەوەش هەواو هەوەسە، ئەم جۆرە حاکمانە یاخین و کەوتوونەتە ناو گوناهە گەورەکانەوە ، تاوان و گوناهەکەشی بەپێی ئەو حوکمەی کە دەیدات زیاد دەکات ، کەمبێت یان زۆر ، بەڵام کافر ناکرێت چونکە حوکمی بە شەرع کردووە ، ئەگەرچی ستەمکاریش بێت ، هەروەها لەو بابەتانەی تریش بۆ نمونە لە هەندێك بابەتدا کار بە حوکمەکان نەکات و پەکی بخات ، وەکو وازهێنان لە حوکمدان بەسەر یەکێك لە نزیکەکانیدا ، یان کەسێك بەرتیلی پێدابێت و هەروەها ، ئەمەش هەر ستەمکارە و کەوتۆتە ناو تاوانی گەورەوە ، بەڵام کافر ناکرێت چونکە کارەکەی تاوانە (تاوانی وازهێنان) و حوکم کردن نییە بە یاسا و شەرعی طاغوت ، جیاوازی هەیە لە نێوان کەسێك کە لە هەندێك بابەتدا واز لە حوکم کردن بەوەی کە خوا دایبەزاندووە بهێنێت و کەسێکیش حوکم بەوە نەکات کە خوا دایبەزاندووە لە دۆسیە و کێشەکاندا .

دووەم : ئەوکەسەی لە هەموو کاروبارەکانیدا بۆ شەرع دەگەڕێتەوە ، بەڵام لە دۆسیەیەکدا لا دەدات بەلای حوکمی طاغوتدا ، بۆ نمونە لە بابەتی دەستبڕیندا کار بە یاسای فەڕەنسی بکات و لە زینادا کار بە یاسایەکیتر بکات و هەروەها ، ئەمە کافر دەکرێت ئەگەرچی تەنهاوتەنها لە یەك دۆسیەدا کاری بەو یاسایانە کردبێت ، چونکە حوکمی بە طاغوت کردووە .

ئەگەر جیاوازی ئەو دووانەت زانی ، ئەوە وەڵامەکەت بۆ ڕوونبۆتەوە لەبارەی شوبهەی مورجیئەکەوە . والله أعلم .

**36/پرسیار : حوکمی ئەو کەسە چییە کە دەڵێت : (یارسول الله داوا لە خوا بکە لێم خۆشبێت)؟ ئایا ئەمە هەروەکو ئەوە وایە کە بڵێت : (یارسول الله شەفاعەتم بۆ بکە)؟ حوکمی ئەو کەسەش چییە کە دەڵێت ئەو قسەیە بیدعەیە و شیرکی گەورە نییە؟**

وەڵام : ئەم بابەتە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە ، ئەو جۆرە کەسانە دەکرێن بە دوو بەشەوە:

1- ئەگەر بەو دوعایە هاواری لێکرد و دووربوو لە گۆڕەکەیەوە ، ئەوە هیچ گومانی تێدانییە کە ئەوە شیرکی گەورەیە ، چونکە هیچ شوبهەیەك لەوەدا نییە .

2- ئەگەر لەلای گۆڕەکەوە دوعای کرد ، ئەمیش دەکرێت بە دوو بەشەوە :

أ- ئەوەیە کە داوای چاکبوونەوە یان بە هاناوە چوون یان سەرکەوتن یان شتی تری لێبکات ، ئەمەشیان هەر شیرکی گەورەیە .

ب- ئەوەیە کە بڵێت :﴿داوام لە خوا بۆ بکە﴾، یان ﴿شەفاعەتم لەلای خوا بۆ بکە﴾ ، کە هەر هاوشێوەی یەکن ، ئەهلی عیلم لەبارەی ئەوانەوە دوو قسەیان هەیە :

- پێشەوایانی بانگەوازی نەجدی وای دەبینن کە ئەوە شیرکی گەورەیە و لە هاوشێوەی شیرکی قوڕەیشە ﴿هؤلاء شفعاؤنا عند الله﴾ ، ﴿إلّا لیقربونا إلی الله زلفی﴾ .

- لەوانەی دوای ئەوانیش هەیانە وای دەبینێت کە بیدعە و مونکەرە و هۆکارێکە بۆ چوونە ناو شیرکەوە ، بەڵام کوفر نییە ، چونکە شوبهەیان هەیە ئەویش ئەوەیە کە ژیانی ناو گۆڕی هەیە و وەڵامی سەلامی ئەو کەسە دەداتەوە کە سەلامی لێدەکات و هەروەها ، ئینجا ئەوانە بەلای خۆیانەوە داوا لە شتێك ناکەن کە لەوێ نەبێت و توانای نەبێت ، بە هیچ شتێکیش لە سیفاتەکانی ربوبیەت وەکو هاوار لێکردن و شیفادان و هەروەها... هاواری لێ ناکەن ، ئەو کەسە مردووە هەر وەکو کاتی زیندوویێتی وایە کە چۆن داوای

دوعایان لێدەکرد ، به کۆدەنگیش شیرك نییه ، ئەو ئێستا له گۆڕەکەیدایه زیندووه ، ئەمه شوبهەکەیانه .

ئەوەشی بەلای منەوە پێکاویەتی و دروسته ئەوەیه که ئەو هاوارکردنه شیرکی گەورەیه ، بەڵام دەبێت پۆزشی به نەزانی بۆ بهێنرێتەوە و تأویلی قەسەکەی بکرێت به هۆی بەهێزی شوبهەکەیانەوە لێرەدا ، والله أعلم .

**37/پرسیار : حوکمی ئەم قسەیە چییە : (فلآن کەس دیموکراسییە) یان (من دیموکراسیم) یان (ئێمە دیموکراسیمان دەوێت) لە کاتێکدا ئەو کەسە ناشزانێت واتای ڕاستی دیموکراسی چییە ، بەڵکو گومانی وایە کە واتای ڕاوێژی هەیە ، هەتا ئەگەر بتوانێت بگەڕێت و پرسیاریش بکات لەبارەیەوە؟**

وەڵام :

- ئەگەر مەبەستی بەو وشەیە ڕاوێژ بێت ئەوە تەکفیر ناکرێت بە قسەکەی ، بەڵام وشەکە مونکەرە، پێویستە لەسەری بیگۆڕێت بە وشە شەرعییەکان کە هیچ لێڵییەکیان تێدانییە.
- ئەگەر واتاکەی دەزانی کە حوکمی گەلە و مەبەستی ئەوەبوو ، ئەمەیان کافر دەکرێت .
- ئەگەرچی کەسەکە ماناکەشی بزانێت بەڵام مەبەستی پێی ئەوە نەبێت بەڵکو مەبەستی پێی ڕاوێژ بێت ، هەروەها ئەمەش کافر ناکرێت ، بەڵام وشەکە مونکەرە ، والله أعلم .

**38/پرسیار : ئایا لە پێشینەوە هاتووە بە دیاریکراوی تەکفیری ئەو خەلیفانەیان کردبێت کە بانگەشەی خەلقی قورئانیان دەکرد ؟**

وەڵام : بەڵێ ، تەکفیر کردنیان جێگیربووە لەلایەن هەندێك لە پێشینەوە :

- مأمون : خەللال لە ﴿السنة﴾دا (5/90) و بێجگە لەویش گێڕاوایانەتەوە ، لە أبي طالبەوە بە احمدی وت : کە ئەوان بە طرسوسدا دەڕۆن بەلای گۆڕی پیاوێکدا ﴿ناوەکەی نەوت بەڵام مەبەستی پێی مأمونبوو﴾ دەیانوت : ئەو کافرە خوا ڕەحمی پێ نەکات . احمدیش فەرمووی : بەڵێ! خوا ڕەحمی پێ نەکات ، ئەوبوو ئەوەی دامەزراند و گەیشتە ئێرە .

- واثقیش ئەحمدی کوڕی نەصری خوزاعی تەکفیری کردووە ﴿سەیری مێژووی ابن الأثیر بکە لە ڕووداوەکانی ساڵی 230 و ئەو دەوروبەرە والله أعلم﴾ .

- ئەبوداود لە مسائلەکانیدا(1696) فەرموویەتی : گوێم لە ئەحمدبوو کە پیاوێك بۆی باسکردووە کە پیاوێکی تر وتوویەتی : ناوەکانی خوا دروستکراون و قورئان دروستکراوە، ئەحمەد فەرمووی : کوفری ئاشکرای کردووە .

- هەروەها لە مسائلەکانیدا (305) فەرموویەتی : بە ئەحمەدم وت لەبارەی ئەو ڕۆژانەی کە نوێژی بە جەماعەت دەکرد لەگەڵ جەهمییەکاندا ، پێم وت : ئەی جومعە؟ فەرمووی : دەیگێڕمەوە ، هەر کاتێکیش نوێژم لە پشت هەر کەسێکەوە کردبێت وتبێتی قورئان دروستکراوە نوێژەکەم گێڕاوەتەوە ، پێم وت : لە عەرەفەش؟ فەرمووی : بەڵێ .

ئەمە ڕەددێکە بۆ ئەوانەی کە قسەی ئیمامی ئەحمەد دەگوێزنەوە لەسەر تەکفیر نەکردنی تاکەکانی جەهمیە و ئەوەشی کە دەڵێن ئیمامی ئەحمەد نوێژی لە پشتیانەوە کردووە ، بەڵام لێیەوە ناگوێزنەوە کە نوێژەکەی دووبارە کردبێتەوە ، والله أعلم .

**39/ پرسیار : حوکمی بەکارهێنانی ئەم وشەیە و وتنی بەرانبەر برا موجاهیدەکانمان : ﴿الإرهاب﴾ چییە ؟**

وەڵام : لێرەدا پێویستە جیاوازی لە نێوان دوو شتدا بکەین لە الإرهابدا :

یەکەم : بنچینەی مەشروعییەتی جیهادە ، جا هەر کەسێك قسە بکات لەبارەی ئەم بنچینەیەوە وەکو سەرکردە و کلکەکانیان لە ڕۆژنامە نووسەکان ، ئەوە هیچ گومانی تێدانییە کە کوفرە .

دووەم : هەر کەسێك قسە بکات لەبارەی هەندێك لە موجاهیدانەوە نەك هەموویان و بە ئەهلی جیهادیان دانەنێت ، ئەوانە تەکفیر ناکرێن ئەگەر دان بنێن بە بنچینەی جیهادی في سبیل الله دا ، بەڵام نکوڵی هەندێك کار دەکەن کە وەکو کاری تێکدەرانە دەیبینن ، بۆ نمونە: تەقینەوە لە شوێنی نیشتەجیّ بووندا ، کوشتنی ئەوانەی کە لەسەر ئیسلام دادەنرێن وهەروەها ، نکوڵی کردن لە جیهاد شتێکە و نکوڵی کردن لە هەندێك کاری موجاهیدان شتێکی ترە ، پێغەمبەریش صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی : اللهم إنّي أبرأ إلیك مما صنع خالد . واتە : خوایە من بیّ بەری بوونی خۆم ڕادەگەیەنم لەلای تۆ لەو کارەی کە خالد کردی. لە بەسەرهاتی بنو جذیمة ، هەروەك نکوڵی کردنی عومەر لە خالد دروستبوو لە ڕۆژانی أبوبکردا ﴿ڕەزای خوا لە هەموویان بێت﴾ ، هەروەها لە وەختی فیتنەی نێوان عەلی و موعاویەشدا دروستبوو .

مەبەست لێرەدا جیاکردنەوەی ئەو دوو بابەتەیە ، بەڵام قسەکەمان مانای ئەوە نییە ئیتر کە تەکفیر نەکران تاوانبار نین لەسەر ئەو قسەیەیان ،بەڵکو تاوان بەریان پیّ دەگرێت بەپێی ئەو

کەمتەرخەمییەی کە کردوویانە لە وەرگرتن و داواکردنی حەق و بەلادا چوون و نەرمبوونیان لەگەڵ ئەهلی باطلدا ، والله أعلم .

**40/ پرسیار : حوکمی ئەو کەسە چییە کە دەڵێت : (برا جوولەکە و گاوور و شیعەکانمان) . لە ڕووی دەرگای بانگەوازەوە ، و تأویلی ئەو ئایەتانە دەکەن کە لە سورەتی الشعراء دا هەیە، و دەڵێن مەبەست لەو ئایەتانە برایەتی مرۆڤایەتییە؟**

وەڵام : قسەی ئەو کەسانە لەبارەی برایەتی لەگەڵ جوولەکە و گاوورەکاندا ، من پێش زیندان توێژینەوەیەکم نووسی لەسەر ئەم بابەتە لە بەرانبەر ڕەددانەوەی قەرزاوی ، بەڵام بڵاو نەکرایەوە چونکە تەواوم نەکردبوو ، قسەیەکی پیس و خراپە ، چونکە برایەتی دەکرێت بە دوو بەشەوە کە سێیەمیان بۆ نییە :

- برایەتی دینی ﴿إنّما المؤمنون إخوة﴾ .واتە/ بێگومان بەس باوەڕداران برای یەکن .

- برایەتی ڕەچەڵەك ﴿و إلى عاد أخاهم هوداً﴾. واتە / بۆ عادیش براکەیان هودمان نارد .

هیچ شتێك لە نێوان ئەوان و لە نێوان ئەوانەش کە یەکدەگرن و برایەتییان هەیە لە دیندا نییە ، هیچ بەشێکیشیان لە ڕەچەڵەکدا لەگەڵ یەکتر نییە ، ئیتر ئەمە چ برایەتییەکە کە بانگەشەی بۆ دەکەن؟! پاشان ئەوە دژی بیروباوەڕی وەلاء و بەرائە ، بەڵگەکانیش لەسەر ئەو بابەتە زۆر لەوە زیاترن کە تەسك بکرێنەوە .

بەڵگەهێنانەوەشیان لە سورەتی الشعراء ، ئەوە بۆ خۆی لە دووڕووەوە دەبێت بە بەڵگە بەسەریانەوە :

یەکەم : فەرموودەی خوا پەروەردگار کە دەفەرمویت : ﴿إذ قال لهم أخوهم﴾﴿أخوهم هود﴾﴿أخوهم صالح﴾﴿أخوهم لوط﴾ هەموویان لە برایەتی ڕەچەڵەکن ، بۆ نمونە چۆن عەرەب بە تەمیمییەك دەڵێت : یا أخا تميم . واتە: ئەی برای تەمیم . ئەمەش لە زماندا ناسراوە.

دووەم : خوای پاکوبێگەرد دەفەرمویت : ﴿كذب أصحاب الأيكة المرسلين . إذ قال لهم شعيب...الآية﴾ ، لەگەڵ ئەوەشدا لە شوێنێکی تردا دەفەرمویت : ﴿وإلى مدين أخاهم شعيباً﴾ ، سەیری جیاوازییەکە بکە کاتێك ڕەچەڵەکەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ هۆزەکەی دەفەرمویت : ﴿أخاهم شعيبا﴾ ، بەڵام کاتێك دەیگەڕێنێتەوە بۆ شیرك دەفەرمویت : ﴿أصحاب الأيكة﴾ ، برایەتی پچڕاند و باسی نەکرد ، ئەمەش لە بەهێزترین بەڵگەکانە بۆ ڕەددانەوە لێیان ، خوای پەروەردگار برایەتی ڕەچەڵەکی پچڕاند کاتێك کە ڕەچەڵەکی خستنە سەر شیرك ، جا چۆن کەسێك دەبێتە برات کە دینی لەگەڵ تۆ جیاواز بێت و هیچ بەشدارییەکیشی لە ڕەچەڵەکدا نەبێت لەگەڵتدا ؟! والله أعلم .

41/ پرسیار : **ئەنجومەنە شارەوانییەکان بریتین لە وێنەیەکی بچوککراوە لە کاری پەرلەمان بە بەڵگەی ئەو کارانەی کە لەبارەیانەوە دەیزانم دەیکەن ، ئەم ئەرکەش بریتیە لە مۆڵەتدان بە هاونیشتمانییان بۆئەوەی کە بەشداربن لە بەڕێوەبردنی خزمەتگوزاری شارەوانییەکان لە میانەی ئەو بڕیارانەی کە دەدرێت لە کاروباری شارەوانیدا و چاودێری کردنی بەڕێوەبەرایەتی شارەوانییەکان و دەرکردنی بڕیارەکانیدا ، وای لێدەکات کە ببێتە هاوبەشی لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی و جێبەجێ کردنی کارەکان لە بەڕێوەبەرایەتی شارەوانیدا بەوەی کە بەرژەوەندی گشتی دەستەبەر دەکات بۆ هاونیشتمانییان ؟**

وەڵام : بەتەواوی کاری ئەو ئەنجومەنە بەڕێوەبەرایەتییانە نازانم چییە ، بەڵام گومان لە حەرامی چوونە ناو ئەو جۆرە شوێنانەدا نییە ، لەبەر چەند هۆکارێك ، لەوانە زۆربەی کارەکانی باطلە و ملکەچ ناکات بۆ شەرع بەڵکو مل بۆ سیستمەکە دەدات ، لەوانە ئەوانەی کە ئەنجومەنی حوکم دەرکردنن ، کە بە حوکمی غەیری ئەوەی خوا دایبەزاندووە پشتگیری دەکرێت و لە ڕێگەی دەنگدانەوە دێت و هەروەها , والله أعلم .

**42/ پرسیار : لە وەڵامی پێشوودا -خوا بتانپارێزێت- لەبارەی ئەنجومەنی شارەوانییەکانەوە فەرمووتان : لە ڕێگەی ئەوەوە دێت کە پێی دەوترێت هەڵبژاردن ، ئایا ڕووی حەرام لەم هەڵبژاردنانەدا چییە ، ئایا لە بەشی نەهی کردنە لە داواکردنی سەرۆکایەتی ، یان لە بەشی خۆچوواندنە﴿التشبه﴾ ، یان چی؟ سوودمان پێبگەیەنە خوا بتپارێزێت .**

وەڵام : لە ڕووی داواکردنی کار و لە ڕووی چوونە ناوەوەی ئەو کەسانەی کە کەسایەتییان نییە تا هەڵبژێردرێن و لە ڕووی خۆشوبهاندن بە کافرانەوە و لە ڕووی دەنگدان بە کەسانی فاسق و بێجگە لەوان ، زۆری تریش لەو جۆرە مونکەرانە. والله أعلم .

**43/ پرسار : حوکمی ئەم وتەیە چییە : فلان کەس هەموو گیانی بەرەکەتە ، یان ئەمە لە بەرەکەتی تۆوەیە فلان کەس ، یان بەرەکەتت بۆ هێناین ، یان بەرەکەت سەردانی کردین ، لەو جۆرە وتانە؟**

وەڵام : وشەی ﴿تبارکت﴾ کۆمەڵێك لە زانایان باسیان کردووە وەکو ابن القیم ، کە ئەو وشەیە تەنها بەرانبەر خوای پاکوبێگەرد دەوترێت ، چونکە لەسەر بنچینەی بە گەورە دانانە، بۆ نمونە : ﴿تعالی و تقدس﴾ ، ئەمما بێجگە لەوە ئەوەی کە باست کردووە هیچ شتێکم بەرچاو

نەکەوتووە کە ئەو جۆرە قسانە کێشەی تێدابێت ، چونکە دانیشتن لەگەڵ براکانتدا و سەردانی کردنیان و قسەکردن لەگەڵیان لە بەرەکەتن ، بەرەکەتیش شتێکی دیاریکراو نییە و لەسەر شتە هەست پێ کراو و هەست پێ نەکراوەکانیش دەوترێت ، شتەکانیش مەبەستی کەسەکە دەردەبڕن . واللە أعلم .

## 44/ پرسیار : حوکمی ئەو کەسە چییە کە ڕەگەزنامەکەی دەخاتە سەر ڕەگەزنامەی وڵاتێکی کافر یان مرتد؟

وەڵام : ڕەگەز خستنە سەر ڕەگەزنامەی هەر وڵاتێك بەپێی ئەوەی کە تیایەتی لە مەرج و پابەندبوون ، ئەگەر کوفر بێت ئەوە کوفرە ، ئەگەریش حەرام بێت ئەوە حەرامە . واللە أعلم.

## 45/ پرسیار : حوکمی تەماشکردنی سێرك و فیلمە پاڵاوانێتییەکان چییە؟ و ئایا دەچێتە ناو سەیرکردنی جادووەوە؟

وەڵام : سێرك لە زۆربەی یارییەکاندا دەچێتە ناو بازنەی جادووەوە بە واتا گشتییەکەی (شتێك دەکات و هۆکارەکەی دەشارێتەوە) ، بە دووریشی نازانم کە زۆربەی ئەو یارییانە بە واتا ڕاستییەکەی دەچێتە ناو بازنەی جادووەوە . مونکەراتی سێرك زۆرن و بە تەنها ئەوە نییە . واللە المستعان .

**46/ پرسیار : ڕەددی ئەو کەسانە چییە کە ئارەزووی خۆیان وەکو مەرج دادەنێن لە ڕاستی و دروستی جیهاددا؟ و پێوەرەکانی ئەم قسەیە چین؟ لەگەڵ ڕەددانەوەی شوبهەکانیان و بەڵگەهێنانەوەکانیان .**

وەڵام : ڕەددانەوەی ئەوانە بە درێژی تەنها بەوە دەبێت کە بە درێژی لەسەر قسە و بەڵگەکانیان بوەستین ، بە تەنها لەسەر ئەوەش ناوەستم ، بەڵام لەوانەیە یەکێك لە بەڵگەکانیان قۆناغی مەدینە بێت ، کە جیهاد لە قۆناغی مەککیدا فەرز نەبووە ، هەروەها فەرموودەی خوای تعالی : ولولا رجال مؤمنون و نساء مؤمنات لم تعلموهن أن تطؤوهم فتصيبكم منهم معرة بغير علم . واتە : خۆ ئەگەر لەبەر ئەو پیاو و ئافرەتە باوەڕدارانە نەبووایە کە نەتاندەزانی کێن پێشێلتان دەکردن و بەهۆی ئەوەوە باری گرانتان تووش دەبوو لێیانەوە بەبێ ئەوەی بزانن . ئەم بەڵگەیە ئەگەر تەواویش بێت ئەوە بەهیچ شێوەیەك بەڵگە نییە لەسەر مەرجەکە ، لەبەرئەوەیە هیچ کەسێك لە فەقیهە بەناوبانگەکان باس ناکەم کە مەیل و ئارەزووی بە مەرجێکی جیهاد دانابێت ، ئەگەر ئێوەش شتێك لەوبارەیەوە دەزانن سوودمان پێ بگەیەنن خوا پاداشتی خێرتان بداتەوە ، بەڵکو فەقیهەکان بە تواناییان هێناوە، ئەوەش مەرجێکە کە هەموو دەقە گشتی و تایبەتییەکان جەختی لێ دەکەنەوە . بە تواناییش بە جیاوازی کات و شوێنەکان جیاوازە ، قۆناغی مەدینەش کە تیایدا جیهاد فەرزبوو لەبەرئەوەبوو کە توانایان هەبوو بەسەر ئەنجام گەیاندنی کارەکە . بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم جیهادی لەگەڵ بنو قینوقاع و بنو النضير و بنو القريظة کرد و هەمووشیان لەگەڵیدا دەژیان لە مەدینەدا ، ئەمما ئایەتەکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەو کاتە تەنگی پێ هەڵنەچنرابوو هەتا جەنگی مەککە بکات ، لەبەرئەوە ڕێککەوتنی

لەگەڵدا کردن و دوای ئەوە جەنگی خەیبەری کرد ، ئینجا دوای ئەوەی کە موشریکان پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جەنگی لەگەڵ کردن لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو باوەڕدارە پیاو وئافرەتە لە مەککەدا ، قسەکردنیش لەمبارەیەوە درێژە دەکێشێت ، بابەتەکانی شارەزایی و مەرجەکانی ئەوانە کەسانی شارەزا و ناو جیهاد دەیزانن، نەك ئەوانەی کە لەسەر زانست دادەمەزرێن ، چونکە زۆربەی زۆری ئەوانەی کە لەسەر زانست دامەزراون نەزانترین کەسن بە کاروباری جیهاد لەسەر ئەرزی واقع ، ئەگەرچیش حوکمە شەرعییە گشتییەکانی جیهاد دەزانن ، بەڵام شتە گەورەکە لە لێکۆڵینەوەی جۆری ئەو حوکمەدایە ، جاری واهەیە کۆبوونەوە لە شوێنێکدا مەترسی هەیە لەسەر موجاهیدان ، هەروەکو ئەم کاتەی ئێستامان لەگەڵ پێشکەوتنی چەکەکان و هەبوونی مانگە دەستکردەکان و فڕۆکەی بێ فڕۆکەوان و موشەکی دوورهاوێژ و هەروەها ، خوا قەت ئەوە نەکات بە چاو تروکانێك هەموو موجاهیدان ئیبادە دەکات ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە یەك شوێندا نەبن هەروەکو دیارە ، هیچ گومانێکیشی تێدا نییە کە کافران ئاواتەخوازن کە موجاهیدان هەموویان لە یەك شوێندا کۆببنەوە بۆئەوەی بۆردومانیان بکەن ، ئەمەش بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ڕەددانەوەی ئەوانە ، بشزانە کە زۆربەی ئەو مەرج و ئاڵۆز کردنانە لە کاروباری جیهاددا زۆربەی بۆئەوەیە کە ڕقیان لە جیهادە و دەیانەوێت دەرگاکەی دابخەن ، چونکە زۆربەی بانگخواز و طالب علمەکان حەزیان لە پاڵدانەوە و پشوو و دەرکەوتن لەسەر تەلەفزیۆن و ماچکردنی سەری یەکترییە ، ئەمانەش لەگەڵ جیهادکردندا یەکناگرن و نامێنن، شيخ الإسلام ابن تيمية ﴿ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ دەفەرموێت : لوتکەی ئەوەش جیهادکردنە لە پێناوی خوادا ، چونکە بەرزترین شتە کە خوا و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم

خۆشیاندەویت ، ئەوانەشی کە سەرزەنشتییان دەکەن زۆرن ، زۆربەی ئەو خەڵکەی کە باوەڕیان هەیە حەزیان لێی نییە ، ئەوانە یان شکست پیێ هێنەرێکی درۆزنن بۆ هەوڵدان بۆی و ئیرادەی کارکردنیان تیایدا ، یان خەڵك پەشیمانکەرەوە و لاوازن لە بەرانبەر ئەوەی کە بەهێز و بە توانا بن بەسەریدا ، ئەوانەش هەر هەمووی لە دووڕووین ..، یان هەروەکو ئەوەی دەیلێیت . والله أعلم .

**47/ پرسیار : ئایا دروستە لەسەر کتێبی وەقف شت بنووسرێت ، هەروەها دروستە وەربگیرێت و لە وێنەی ئەو بفرۆشرێت لە کاتی پێویستدا ؟**

وەڵام : نووسین لەسەر کتێبی وەقف ڕوونکردنەوەی تێدایە :

- ئەگەر ئەو کەسەی کتێبەکەی وەقف کردووە مەرجی دانابێت کە نابێت هیچی لەسەر بنووسرێت ، ئەوە دروست نییە هیچی لەسەر بنووسرێت .
- ئەگەر ئەو مەرجەی دانەنابێت :

- ئەگەر نووسینە هەر لەخۆوە بێت و هیچ سوودی نەبێت ئەوە دروست نییە ، چونکە مامەڵەی بە غەیری موڵکی خۆیەوە کردووە بەبێ ئەوەی هیچ سوودی هەبێت .
- ئەگەر نووسینەکە بەسوودبوو وەکو دەرهێنانی فەرموودەیەك یان پێناسەی پیاوێك یان ڕوونکردنەوەی حوکمی بابەتێك یان ڕەوانەکردنی بۆ کتێبێکیتر یان چاککردنەوەی هەڵەیەك و هەروەها ، ئەوە هیچی تێدانییە ، بەڵکو ئەو وردە نووسینانە کتێبەکە زیاتر بەهێز و جوان دەکات ، هەروەکو دەوترێت : لا يضيء الكتاب حتى يظلم . واتە:

کتێب نادرەوشێتەوە هەتا ڕەش نەکرێتەوە . واتە ئەگەر پەراوێزی بەسوودی زۆری لەسەربوو .

ئەگەر کەسێکیش شتی لەسەر کتێبێکی وەقف نووسی و پێویستی بەو شتانەبوو کە لەسەری نوسیوویەتی بۆئەوەی لەلای خۆی پارێزگاری لیٚ بکات و لە جیاتی ئەوە کتێبێکی تری کڕی و لە جیاتی ئەو کتێبە وەکو وەقف داینا ، ئەوەی بۆم دەرکەوتووە دروستە ، لەبەر یەکگرتنی ئەو سوودەی کە مەبەستییەتی ، چونکە ئەو کەسەی کتێبەکەی وەقف کردووە مەبەستی خێرە ، ئەوەش ئەوەیە کە لەناو ئەو کتێبەدایە و مەبەستی چواردەوری نووسنی ناو کتێبەکە نەبووە ، مەبەستەکەش لە کتێبێکی تردا بەدەست دێت ، واللە أعلم .

**48/ پرسیار : کحول ئەگەر بێتو ژەهراوی بێت یان کوژەر بێت لە عەتر و بێجگە عەتریش ، ڕاتان چیە لەسەر ئەم بابەتە؟**

وەڵام : کحول و مەی ئەگەر لەگەڵ بێجگە لە خۆی تێکەڵ بکرێت دوو ڕووی هەیە :

1- ئەگەر گۆڕدرا بۆ ماددەیەکیتر کە سەرخۆشکەر نەبێت ئەوە هیچ شتێك لە بەکارهێنانیدا نییە و دروستە بەکاربهێنرێت ، بۆ نمونە وەکو مەی ئەگەر بکرێتەوە بە سرکە .

2- ئەگەر نەگۆڕدرا و لەسەر ئەوە مایەوە کە ماددەی سەرخۆشکەر بێت ، ئەوە دروستنییە هەتا ئەگەر گرانبەهاش بێت ، لەبەر دوو یان سیٚ هۆکار :

أ- مەی بەهیچ شێوەیەك دروستنییە هەڵبگیرێت و پارێزگاری لێبکرێت ، هەروەکو دەقەکان بەڵگەن لەسەری لە بە سرکە کردنی مەیدا ، هەروەها فەرمان کردن بە دوورکەوتنەوە لەو کارە وبێجگە لەویش . بە هەمان شێوە لێرەدا کە پێکهاتەکەی گرانبەهایە دەریناکات

له سیفەتی مەی ، چونکە هۆکاری مەی بریتیە له سەرخۆشکردن (هەموو سەرخۆشکەرێکیش مەیە) .

ب- مەی پیسە ، ئەوەش مەزهەبی هەرچوار پێشەواکەیە ، هەرئەوەشە کە پێکاویەتی و لێکۆڵەرەوانی وەکو ابن تیمیة و ابن القیم و بێجگە لەوانیش هەڵیانبژاردووە، بەتایبەتیش شتی پیس پێویستە و واجبە لێی دووربکەویتەوە ، هەرئەوەشە کە فەرمانی پێکراوە لە مەیدا ﴿فاجتنبوه﴾ ، پیسیش لە پیسێتییەکەی خۆی دەرناچێت لەبەرئەوەی پێکهاتەکەی گرانبەهایە .

ت- هەروەها ئەوە ڕێگرتنە لە بڵاوبوونەوەی .

لەسەرئەوەی کە هەندێك جۆری کحول لە عەترەکاندا هەن ، کە پێی دەوترێت (ئیسپرتۆ) ، خۆی بۆ خۆی ژەهر نییە بەڵکو زۆر بەکارهێنانی خراپە ، لەبەرئەو هۆکارەشە کە هەندێك جۆری مەی خوا بمانپارێزێت لێی کوژەرە ئەگەر کەسەکە بیخواتەوە و ئاوی تێنەکات بۆئەوەی کە خەستییەکەی کەم بکاتەوە ، ئەوەش وەکو زۆربەی ئەو ماددانەیە کە پێویستە سووك بکرێن و کاریگەرییەکەیان کەم بکرێتەوە پێش بەکارهێنانیان وەکو ماددە بێهۆشکەرەکان و بێجگە لەوانیش .

لە ساڵی 1419ك نامیلکەیەکم نووسی بەناونیشانی : ﴿حكم العطورات الكحولية﴾ ، هەشت بەڵگەم لەسەر حەرامبوونی باسکردووە ، بەڵگەی هەشتەمیش (پیسییە) ، چونکە زۆربەی طالب علمەکان وادەزانن کە حەرامی ئەو ماددانە بەهۆی پیسییەکەیەوەیەتی ، ئەگەر پاکی ماددەکە سەلما ئەوە حەرام نییە ، هەر لەبەرئەوەش کردم بە بەڵگەی کۆتایی . لەو بەڵگانەی وەسفیان کردووە کە پیسە و لە کاری شەیتانە و فەرمانکراوە بە هەتاهەتایی دوورکەوتنەوە

لێی ، نەهی کردنیش لە بە سرکە کردنی مەی و فەرمانکردن بە ڕشتنی بەشە مەی هەتیو، لەعەنەتکردن لە مەی (کە دە کەس تیایدا بەر ئەو لەعنەتە کەوتووە) ، لەعنەت لێ کراویش پێویستە لێی جیاببیتەوە ، وەکو ڕێگە گرتنێکیش لە بڵاوبوونەوەی ، کۆمەڵێکیش لە وتەی هاوەڵان هەیە کە نەهییان کردووە لە بەکارهێنانی مەی لە بۆیە و قژ داهێنان و شتی تریشدا.

والله أعلم .

**49/ پرسیار : لەم دواییانەدا کۆمەڵە ڕیکلامێکی زۆر بڵاودەبنەوە لەلایەن بانکە ریبەوییە ناسراوەکانەوە بەوەی کە پێی دەڵێن بەوەرەقەکردنی خێر ، یان بەوەرەقەکردنی موبارەك ، لە کۆتایی ڕیکلامەکەشدا بەمە کۆتایی پێ دەهێنن (پشتگیری کراوە لەلایەن لیژنەی شەرعییەوە) ، ئایا ئەمە دروستە ؟**

وەڵام : بەوەرەقەکردنی ناسراو لەلای فەقیهەکان ، کە جیاوازی تێدا هەیە لەوەی کە کەسێك شتێك بکڕێت بە نرخێکی دواخراو ، پاشان بیکرێ بۆ کەسی سێیەم بەبێ ڕێککەوتنێك یان کە پێشتر هەبووبێت  یان هیچ فێڵ کردنێکی تێدابێت -نرخی کاش کەمتر بێت لە نرخی دواخراو- ، تێکڕای زانایان بە دروستی دەزانن ئەگەر هیچ فێڵێکی تێدا نەبێت لەسەر ڕیبا کردن ، هەروەها بەیەکگەیشتنی نێوان لایەنەکان ، هەندێك لە ئەهلی عیلمیش وای بۆ چوون کە حەرامە ، گێڕانەوەیەکە لە ئیمامی ئەحمەدەوە و شیخ الإسلام ابن تیمیەش ئەوەی هەڵبژاردووە ، چاکتیش وایە لەو جۆرە شتانە خۆ بەدوور بگرین ، بەڵام ئەگەر کەسەکە پێویستی پێی بوو و هیچ قەرزی دەستنەکەوت لەلای کەس ان شاء الله هیچ شتێکی تێدانییە

بەو مەرجانەی کە باسکراون ، ئەوەیە کە هەردوو پەیمانەکە دروست و بیٚ پیٚچوپەنا بن و هیچ فیٚلیٚك یان ڕیٚککەوتنیٚکی پیٚشتری تیٚدا نەبیٚت .

ئەمە ئەو بە وەرەقەکردنە ناسراوەیە کە لە کتیٚبەکانی فیقهدا هەیە ، ئەمما بەوەرەقەکردن بۆ خەرجکردن کە لە بانکە ڕیبەویەکاندا بەربلاٚوە ، بریتیە لە داهیٚنانی ئەهلی فیٚلٚ و تەلٚەکەبازی و یاریکەران بە شەرع ئەوانەی کە پیٚیان دەوتریٚت لیژنە شەرعییەکان ، ویٚنە دیار و بەربلاٚوەکەشی ئەوەیە کە ئەو کەسەی کارەکە دەکات دەیەویٚت قەرز لە بانکەکە وەربگریٚت بە بڕیٚك سوو و ڕیبای ڕاستەوخۆشی ناویٚت ، ئەو لیژنە شەرعییانەش فیٚلیٚکی بۆ دادەنیٚن بۆ خواردنی ڕیباکە (بەویٚنەیەك کە شەرع پشتگیری بیٚت) : ئەویش ئەوەیە کە کەسەکە دەکەن بە وەکیل بۆ کڕینی شتومەك (خوا و فریشتەکانی و خەلٚك و بانك و لیژنە شەرعییەکەش دەزانن کە ئەو کەسە ئەوەی ناویٚت و ناشیناسیٚت و مولٚکی ئەویش نییە ، بەلٚکو دەیەویٚت بڕیٚك پارە قەرز بکات) ، ئینجا بانکەکە لیٚی دەکڕیٚت-بەقسە خۆیان- ، پاشان دەیفرۆشیٚتەوە بە نرخیٚکی دواخراو بە کەسەکە -کە هەر لە بنچینەدا شتەکەی نەبینیوە و هەر ناشزانیٚت لە کویٚیە؟- پاشان کەسەکە وەکالەتیان بۆ دەکات بە فرۆشتنی شتەکە ، ئینجا بانکەکە دەیفرۆشیٚتەوە - بەقسەی خۆیان- بە نرخی کات و کەمتر لە نرخی دواخراو ، پاشان قارەکە دەدەن بە کەسەکە ، ئەنجامی کۆتاییش وای لیٚدیٚت کە قەرزی داوە بە کەسەکە بە سوودیٚکی ڕیبەوی ، ئەمەشیان وەکو فیٚلیٚك داناوە بۆ بە بازاڕکردنی لە ڕیٚی شەرعەوە و بۆ پیٚکەنینیش بە موسلٚمانان ، ئەمە هەروەکو ئەوەیە کە ئەیوب ﴿ڕەحمەتی خوای لیٚبیٚت﴾ فەرموویەتی : ﴿یخادعون الله کما یخدعون الصبیان ، لو أتوا الأمر عیانا کان أهون﴾ واتە : خوا هەلٚدەخەلٚەتیٚنن هەروەکو چۆن منالٚ هەلٚدەخەلٚەتیٚنن ، ئەگەر ئەو کارەی پیٚیانە بیٚ پیٚچ و پەنا

بیکەن باشترە بۆیان . هەروەکو هەندێك لە پێشین لەبارەی ئەم فێڵەوە دەفەرمون : درهەم بەرانبەر بە درهەم نێوانیان پارچەیەك ئاوریشمە . ئەم فێڵەشی کە باسکرا (درهەم بەرانبەر بە درهەمە) لەلایەن لیژنە شەرعییەکانەوە پاڵپشتی کراوە! ، بگەڕێرەوە سەر کتێبی ﴿بیان الدلیل﴾ی شیخ الإسلام کە بە درێژی ڕەددی هەموو ئەوانەی داوەتەوە کە یاری بە دینی خوا دەکەن و گاڵتە بە ئەحکامەکانی دەکەن ، هەروەها کتێبی ﴿إعلام الموقعین﴾ی ابن القیم ، قسەش لەسەر ﴿...﴾ () درێژە دەکێشێت و ئەوەی کە باسم کرد بە ویستی خوا کیفایەتە . ئەوەشی کە سەلامەتی دینەکەی دەوێت دووردەکەوێتەوە لەو ڕیبا خۆرانە و لیژنە شەرعییەکانیان .

أمامَك فانظر أي نهجيك تنهجُ　　　طريقانِ شتى : مستقيمٌ و أعوجُ

سەیری بەردەمی خۆت بکە بزانە چ پەیڕەوێك هەڵدەبژێریت

دوو ڕێگات لەبەردەمدایە : ڕێگای ڕاست و ڕێگای خواروخێچ

## 50/ پرسیار : جیابوونەوە و مانگرتن چییە؟

وەڵام : جیابوونەوە دروستنییە , مەگەر ئەو جیابوونەوەیە خراپەیەکی گەورەتر لاببات ، ئەمەش دەچێتە بەشی لابردنی ئەوەی کە کام خراپەیەیان گەورەترە بە دانانی ئەگەری نزمەکەیان ، مانگرتنیش ئەگەر پێویستبوو دروستە ، ئەگەرچی ئارامگرتن باشترە ، بە مەرجێك زیان بە مانگرەکان نەگەیەنرێت (هەر زیانێك بێت بێجگە لە برسێتی و ماندووبوون)، بە هەرشتێك بێت بە نەخۆشی بێت یان مردن یان شتیتر بێت . ئەوەی بەڵگەیە لەسەر دروستی ئەوکارە ﴿الوصال: بەردەوامبوونی ڕۆژووگرە لە نانخواردنێکی پێش بانگی

بەیانییەوە هەتا نانخواردنێکی تری پێش بانگی بەیانی﴾ کە بە دروستی جێگیربووە کاتێك هاوەڵەکان لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم ئەو کارەیان کردووە هەتا ئەو کاتەی مانگیان دەبینییەوە پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم فەرمووی : ئەگەر داواتان بکردایە ئەو کارەتان لەسەر سووك بکرێت یان لابرێت بۆ خۆتان باشتربوو ، ابن الزبير دوو هەفتە بەو شێوەیە ماوەتەوە و بە بەردەوامی ڕۆژووی گرتووە ، هەروەها کاتێك ئیمامی ئەحمەد و منداڵەکانی لە ساڵی 237ك چوون بۆلای موتەوەکیل ، ئیمامی ئەحمەد چەند ڕۆژێکی زۆر بەردەوامبوو لەسەر ڕۆژووگرتن ﴿کە ئەوەش بۆخۆی مانگرتنە﴾ بۆئەوەی فشار بخاتە سەر منداڵەکانی بگەڕێنەوە بۆ بەغداد ، هەتا وای لێهات چاوی چوو بەناودا و هەتا شەش مانگ چاوەکانی نەگەڕانەوە باری ئاسایی خۆیان ، ڕۆژووەکەی نەشکاند هەتا ئیسحاقی مامی زۆری لێکرد و ڕۆژووەکەی پێ شکاند . مەبەستیش لەوە ئەوەیە کە وازهێنان لە خواردن بە تەنیا حەرام نییە بەپێی ئەو بەڵگانە ، بەڵام ئەگەر زەرەر و زیانێکی ڕوونی هەبێت ئەوە بەهۆی زیانەکەوە دروستنییە نەك تەنها بەهۆی وازهێنان لە خواردن . لەسەر داوای کۆمەڵێك برا لە ساڵی 1425ك بۆ ماوەی سی ڕۆژ مانم لە خواردن گرت ، لەگەڵ ئەوەشدا بێجگە لە برسیەتی هەستم بە هیچی تر نەدەکرد ، بە پێوە نوێژیشم دەکرد و سوپاس بۆ خوا هیچ ئازارێك یان زیانێکی بۆم نەبوو . والله أعلم .

**51/پرسیار : ئایا مەرجە بۆ دەستکەوتنی پاداشتێکی دیاریکراو لە یادکردنەوەکاندا دڵت لەلای ئەو شتانە بێت کە دەیڵێیت ، بۆ نمونە وتەی ﴿لا إله إلّا الله وحده لا شريك له...﴾ سەد جار و ﴿سبحان الله وبحمده﴾ سەد جار ؟**

وەڵام : گومانی تێدانییە ئەگەر دڵت ئامادەبێت کاریگەری بەهێزترە بە ویستی خوا ، بەڵام هیچ دەقێك نییە کە ئەوە بە مەرج بگرێت ، فەزڵی خواش فراوانە ، داوا لە خوا دەکەین کە نەماندانە دەست کارەکانمان و بە بەخشندەیی و گەورەیی خۆی دامانپۆشێت ، فەرمان و بنەما لەمەدا ئەوەیە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ﴿سددوا وقاربوا وأبشروا﴾ واتە : داوای پێ دامەزراوی بکەن و داوای نزیکبوونەوە لە پێ دامەزراوان بکەن و شلڕەوی مەکەن و هەوڵبدەن بۆ بەدەستهێنانی هۆکارەکانی ڕزگاربوون و مژدەدەر بن بەو زانستە جێگیرانەی کە پێتان گەیشتووە ، داوا لە خوای خاوەنی ڕێز دەکەم بە گەورەیی خۆی لەوانەمان دابنێت . والله أعلم .

**52/ پرسیار : حوکمی درۆکردن بۆ بەرژەوەندی چییە بە تایبەتیش لە زینداندا؟**

وەڵام : ئەم بابەتە زاناکان جیاوازن تێیدا ، ابن الجوزي لە ﴿منهاج القاصدين﴾ و النووي لە ﴿رياض الصالحين﴾ و الحافظ لە ﴿الفتح﴾ و ابن مفلح لە ﴿الآداب﴾ و بێجگە لەوانیش ئەو بابەتەیان هێناوە ، لەبەرئەوەی کە کۆمەڵێك فەرموودە هاتووە لەسەر بە دروست دانانی درۆ بۆ چاککردنی نێوانی دوو کەس و لە جەنگدا و لە بەرانبەر خێزاندا - لەگەڵ جیاوازی لە نێوان ئەو دووانەدا- ، زانایان لەمەدا جیاوازییان هەیە ، ئایا بەو سیانە دەپێورێت کە لە ڕەگەزی ئەوان نییە؟ و ئایا ئەو سیانە بۆ قەتیسە و ﴿الحصر﴾ یان بۆ دەرخستنە﴿التمثيل﴾؟ ابن الجوزي

و النووي و الخطابي و بێجگە لەوانیش بۆ ئەوە ڕۆیشتوون کە ئەوەی لە ڕەگەزی ئەوانە بێت دروستە ، یاسا و ڕێکخەرەکەشیان ئەمەیە ﴿کل مقصود محمود لا یمکن التوصل إلیه إلّا بالکذب جاز الکذب﴾ واتە : هەر مەبەستێکی چاکە ئەگەر نەتوانیت پێی بگەیت مەگەر بە درۆ ئەوە درۆکردن دروستە . ئەمە لە غەیری پێویستی و کاتی تەنگانەدا ، لە کۆی قسەکاندا دوورکەوتنەوە لە درۆ هەتا بتوانرێت باشترە بۆ سەلامەتی دینەکەی ، هەروەها لەو عەریزە دوور و درێژانەی کە لەسەر بنچینەی درۆ دەنوسرێن ، بەڵام لەوانەیە لێخۆشبوون بتگرێتەوە بەهۆی زۆرلێکردن و ستەمەوە لە زینداندا کە لە بێجگە لەودا لەوانەیە لێخۆشبوون نەتگرێتەوە ، ئەم بابەتەش هەروەکو دەیبینیت جیاوازی تێدایە و قسەکانیشیان ڕووی خۆی هەیە . والله أعلم .

## 53/ پرسیار : حوکمی بەکارهێنانی ئەو حەبە نەفسییانە چین کە خەولێخەرن ، هەروەها وریاکەرەوە و چالاککەرەکان ؟

وەڵام : دروستنییە ، زانایانیش لەبارەی ئەو شتانەی کە ماددەی هۆشبەرن و هیچ چێژێکیان تێدانییە دوو قسەیان هەیە ، بە جیاوازی ئەو شتانەی کە تامیان هەیە وەکو مەی ، لەگەڵ ئەوەی کە لە ڕەگەزی مەیە لە کاریگەری لەسەر عەقڵ ، زیانبەخشیشە هەروەکو پزیشکان سەلماندوویانە ، مەگەر کەسێك زۆر پێویستی پێی بێت ، هەندێك لە زانایان شتی حەرامیان بە دروست داناوە ئەگەر بۆ دەرمان بەکاربێت ، هەندێکی تریش وەکو ابن تیمیة و بێجگە لەو ئەو شتە بە دروست نازانن ، و بنەماکەشیان ﴿لا ضرورة في دواء﴾ واتە : پێویستی لە دەرماندا نییە . والله أعلم .

## 54/ پرسیار : حوکی خۆپیشاندان چییە؟ و بەڵگەی دروستی خۆپیشاندان چییە؟ و بەڵگەی ڕێگریکەران چییە؟

وەڵام : بابەتی خۆپیشاندان درێژە ، لێرەدا بە کورتی باسی دەکەم :

هەندێك برا کە خۆپیشاندانیان بە دروست داناوە ، لە سوننەتدا بە دواداچوونیان کردووە بۆ دۆزینەوەی بەڵگەیەك لەسەر ئەو بابەتە ، فەرموودەی أبوهریرةیان بە بەڵگە هێناوەتەوە کە فەرموودەی بەناوبانگە لەسەر دراوسێکە ، هەر ئەوەی کە ئێستا پێی دەوترێت کۆکردنەوەی دەنگە نارەزاییەکان ، کە لە سونەنی أبوداوددایە ، هەروەها فەرموودەی عبدالله بن إیاس بن أبي ذباب لە سکاڵای خێزانەکانی ﴿خۆپیشاندانی ژنان﴾ کە ئەویش هەر لە سونەنی أبوداوددایە ، بەڵام پێویست بەمانە هیچی ناکات ، چونکە بنەماکە ئەمەیە ﴿لا یشرع من الدین إلّا ما شرّعه الله و لا یحرم إلّا ما حرّمه الله﴾ واتە: هیچ شتێك لە دیندا پێویست نابێت و نابێت بە شەرع مەگەر ئەوەی کە خوا بە شەرعی داناوە و هیچ شتێکیش بە حەرام دانانرێت مەگەر ئەوەی کە خوا بە حەرامی دانابێت . بنەماش لە بەندایەتییەکاندا تەوقیفییە﴿واتە وەستانە و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت/وەرگێڕ﴾ ، بۆیە پێویستە بەڵگە لەسەر ئەوە هەبێت، بنەماش لە نەریتەکاندا ڕێ پێدرانە ، هەر کەسێکیش حەرامی بکات پێویستە داوای بەڵگەی لێ بکرێت، ئەمە بنچینەکەیە .

جا هەر کەسێك خۆپیشاندانی بە دروست دانا ئەوە دەستی بەو بنچینەیەوە گرتووە ، کە پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە نییە ، چونکە هیچ شێك حەرام نییە مەگەر ئەوەی کە خوا حەرامی کردبێت ، ئەگەر بەڵگەی هێنایەوە لەسەر ڕێپێدانی ئەوە لە بەشی بەخشراوەکاندایە ،

ئەوەشی دەمێنێتەوە ئەوەیە بەڵگەی ئەوانە بزانین کە بە حەرامیان داناوە و بابەتەکەش کۆتایی دێت .

بەڵگەکانیان بەزۆری سێ دانەن : ئەوەیە کە بیدعەیە ، لێکچوواندنی بە کافران تێدایە ، حەرامە وەکو ڕێگرییەك لە تەشەنەسەندنی چونکە خراپەی زیاتری لێدەکەوێتەوە .

1- ئەو قسەیەیان کە دەڵێن : بیدعەیە باتڵە ، چونکە بیدعە لە بەندایەتیدایە نەك لە نەریتدا ، ئەم بابەتەش پێویست ناکات زۆر بچینە ناویەوە بەهۆی ڕوونی باتڵییەکەیەوە .

2- ئەو قەسەیەیان کە دەڵێن : لێکچوواندنی بە کافران تێدایە ، ئەمیشیان هەر باتڵە ، مێژوو پڕە لە کۆبونەوەکانی خەڵك و ڕێ پێوانەکانیان بۆ داوای کردنی ئەو شتانەی کە ویستوویانە ، بگەڕێرەوە سەر ژیاننامەی عوسمان ﴿ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێبێت﴾ ، هەروەها بگەڕێرەوە سەر مێژووی بەصرە و کوفە لە نیوەی دووەمی سەدەی یەکەم بۆئەوەی بزانیت خۆپیشاندانەکان چەند زۆربوون ، ئەوانەش هیچیان بەڵگە نین لەسەر ڕێپێدانی شتەکە ، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هیچ لێکچوواندنێکی بە کافران تێدانییە .

3- ئەو قسەیەیان کە دەڵێن : ئەو خۆپیشاندانانە بەرەو خراپەی زیاتر ڕێچکە دەگرن ، ڕاست نییە ، ئەوەتا ئێمە ئێستا دەیبینین کە لە هەموو شوێنێك دروست دەبێت و هیچ شتێك لەو خراپانەی کە ئەوان باسی لێ دەکەن نەهاتۆتە ئاراوە ، بەڵکو بەرژەوەندی گەورەی لێ هاتۆتە دی ، وەکو ڕووخانی طاغوتەکەی مصر ، ئەگەرچی ڕووخانەکەی حوکمێکی ئیسلامی لە بەرانبەریدا بەرپانەبوو بەس لەگەڵ ئەوەشدا

ستەم و زۆرداری سوكتربوو لەسەر خەڵك ، هەروەها دادپەروەری هاتە كایەوە كە پێشتر لەكاتی ئەودا شتی وانەبوو . ئەمە كورتەیەكی خێرایە لەسەر ئەو بابەتە . واللە أعلم .

**55/ پرسیار : ئایا خۆچوواندن بە كافران ڕێكخەرێكی تایبەتی هەیە؟ و ئایا ئەو خۆچوواندنە بە بڵاوبوونەوەی شتەكە لادەچێت؟**

وەڵام : خۆچوواندن ڕێكخەرەكەی واللە أعلم دەگەڕێتەوە بۆ سێ شت :

1- ئەوەی كە دەقی لەبارەوە هاتووە وەكو ڕیش و جلوبەرگ .

2- ئەوەی كە تایبەتە بە كافرانەوە و نیشانەیەكی ناسینەوەی ئەوانە ، جا لە بەندایەتییەكانیاندا بێت یان لە نەریتەكانیان .

3- ئەوەی كە بڵاوبوونەوەی بە زیان بەسەر موسڵماناندا دەشكێتەوە ئەگەرچی دووردرێژیش بێت .

ئەمما بڵاوبوونەوەی ئەو شتانەی كە بە تایبەتی دەقی لەبارەوە نەهاتووە و تایبەت نییە بە كافرانەوە و بە زیان بەسەر موسڵماناندا ناشكێتەوە ، واللە أعلم ناچێتە ناو لێكچوواندنی حەرامەوە ، وەكو سوارییەكان ﴿سواری : مركب وەكو سەیارە و ماتۆڕ و پاسكیل و ... هەروەها / وەرگێڕ﴾ بۆ نمونە. ئەمما جەلوبەرگ ئەوە بە هیچ شێوەیەك دروستنییە لاساییان بكەیتەوە ئەگەرچیش لەناو موسڵماناندا بڵاوبووبێتەوە ، ئەوە حوكمەكە لانابات چونكە دەقی ڕاستەوخۆ لەبارەیەوە هاتووە ، هەروەها چونكە یەكێكە لە نیشانەكانی جیاكردنەوەی موسڵمان و غەیرە موسڵمان ، واللە أعلم .

**56/ پرسیار : حوکمی لەبەرکردنی ئەو جلە وەرزشییانە چییە کە خاچی تێدایە؟**

وەڵام : جلی وەرزشی هەر لە بنچینەدا دروستنییە ، چونکە خۆچوواندنی بە کافران تێدایە ، هەروەها چونکە بە لەشەوە دەنووسێت و عەورەتی تێدا دەردەکەوێت ، ئەو شتانەشی کە هێمای خاچی تێدایە دروستنییە لەبەربکرێت ، هەرکەسێکیش بیکات ئەوە تاوانبارە ، ئەمما کافربوونی ئەوە بۆم دەرنەکەوتووە ، مەگەر ئەو کەسەی کە بە شتێکی گەورە و پیرۆزی دابنێت ، واللە أعلم .

**57/ پرسیار : کێشەیەك هاتەکایەوە لەبارەی ئەو وەڵامەی پێشووەوە ، ئەویش ئەوەیە ئەو جلەی کە هێمای خاچی تێدایە و لەبەر دەکرێت بەو مەبەستە نەبێت کە بە گەورەی دابنێت ؟**

وەڵام : بابەتی لەبەرکردنی خاچ ئەگەر لەبەر جلوبەرگ بێت مونکەرە هەروەکو پێشتر وەڵامم دایەوە ، ئەگەر نەریتیش لەسەر دانانی ئەو خاچە لەسەر جلوبەرگ بۆ بە گەورە دانانبوو ئەوە کوفرە ، بەڵام بۆخۆی لەبارەی بە گەورە دانانەوە قسە و چاو پێخشاندنەوەی تێدایە ، لەبەرئەوە زانایان فەتوایان داوە بە نادروستی دانانی ئایەت و ناوە جوانەکانی خوا لەسەر جلوبەرگ ، چونکە هەمیشە دەکەوێتە بەرئەوەی کە گرنگی پێنەدرێت و بە چاوێکی بەرز و بەڕێزەوە تەماشانەکرێت . واللە أعلم .

ئاگاداری : برا بەڕێزەکەم دەتبینم هەمیشە چاوت لە حوکمە بنبڕەکانە ، ئەمەش لە زۆربەی بارودۆخەکاندا نایەتەدی و بە دەست نایەت ، بۆیە پێویستە لەسەرت کە بنچینە گشتییەکان بە چاکی لەبەربکەیت و بیانزانیت ، پاشان لە باری جێبەجێ کردنەوە پێویستە بەپێی باری خۆی سەیری ئەو ڕووداوانە بکەیت ، هەموویان وەکو یەك تەماشا نەکرێن ، ئەگەر لە

حاڵەتێکیشدا گومانت بۆ دروستبوو لە بنچینەیەکی گشتیدا ئەوە بوەستە ، سەلامەتیش هیچ شتێکی پێناگاتەوە ، خوا بتپارێزێت .

**58/ پرسیار : لە وەڵامەکەی پێشوودا فەرمووتان کە لەبەرکردنی جلی وەرزشی لە بنچینەدا دروستنییە ، ئایا ئەمە لەسەر برا موجاهیدەکانمان جێبەجێ دەبێت ؟**

وەڵام : نەخێر ، ئەمە لەسەر موجاهیدان جێبەجێ نابێت خوای تعالى سەریان بخات ، وەکو ئەوەی زانراوە ئەوانە کۆمەڵێکی زۆر ئەحکامی تایبەتی خۆیان هەیە ، لەوانەش ئەوەیە کە پەیوەندی بە جلوبەرگەوە هەیە ، والله أعلم .

**59/ پرسیار : کەسانێك هەن کە سەرتاشینیان وەکو یەکێك لە بنچینەکانی تەکفیرکردنی سەرباز داناوە ، ئەوە چۆن دەبێت؟**

وەڵام : سەرتاشین لە بەرزترین جۆرەکانی بەندایەتییە هەروەکو ابن القیم لە ﴿الزاد﴾دا دەفەرموێت ، جا هەرکەسێك سەری بۆ غەیری خوا تاشی لە ڕێگەی ملکەچییەوە هەروەکو چۆن دەروێشەکان بۆ شێخەکانیانی دەکەن و سەربازەکان کاتی وەرگرتنیان لە سەربازی دەیکەن ئەوا ئەو کەسە موشریکە ، هەروەها ئەو کەسەشی کە سەری بێجگە لە خۆی دەتاشێت لە پێناوی زەلیلکردن و بە کۆیلە کردندا ، هەروەکو ئەوەی کە لە زینداندا دەیکەن بەرانبەر بە براکانمان ، ئەوەشیان هەر لە بەشی شیرکدایە ، ناوچەوان دانانەوێنرێت تەنها بۆ خوا نەبێت و لەکاتی قوربانی کردندا . والله أعلم .

**60/ پرسیار : چۆن دەبێت سەرتاشینی سەرباز شیرك بێت ، كە ئەو سەرتاشینە یەكێكە لەو شتانەی پەیوەندی بە نییەتەوە هەیە ، بە واتای ئەوە ئەگەر هەر كەسێك سەری بتاشێت بۆ نزیكبوونەوە لە كەسێك ئەوە كافربووە ، ئەوەشی كە سەری بتاشێت لە بەشی شوێنكەوتنی سیستمەكە ، ئەو سیستمە بیەوێت بەوە ملكەچی خۆیان دەربخەن ئەوەیان كوفرنییە ، بەڵكو تەنها تاوانێكە و حەرامە وەكو ئەوەی كە لە قوتابخانەكاندا ڕوودەدات ، سەرتاشینیش لەسەر نییەتی كەسەكەیە ، خۆ ئەگەر هەر لەسەر یەك ڕوو بێت ئەوە عومەر بە دروستی دانەدەنا كە سەری نصر بن الحجاج بتاشرێت بۆ ئەوەی فیتنەكە لەسەر شێوەكەی لا بچێت ؟**

وەڵام : سەرتاشین لە بەشی ملكەچی كردن بۆ شتێكیتر هەروەكو دەروێشەكان دەیكەن سەریان بۆ شێخەكانیان دەتاشن ، هەروەها سەربازەكان دەیكەن لەكاتی چوونە ناوەوەیان بۆ سەربازی ، ئەوە شیركە ، ناوچەوان دانانەوێنرێت تەنها بۆ خوا نەبێت و لە قوربانی كردندا ، ابن القیم دانی بەوەداناوە كە سەرتاشین لە بەرزترین جۆرەكانی بەندایەتییە ، وەڵامدانەوەی ئەوەش لە دوو ڕێگەوەیە ، كورتوپوخت لەگەڵ بەدرێژی و بە ڕوونی :

كورت و پوخت : ئەگەر سەرتاشینی ئەوانە لە بەشی ملكەچی بۆ خەڵك و خۆ زەلیل كردنبوو بۆیان ، ئەوە هەر یەك بەشە كە شیركە ، ئەگەر ئەوە نەبوو ئەوە پێوانەكە فاسدە و زیان بە بنچینەكە ناگەیەنێت .

بە درێژیش : تاشینی چەند بەشێكی سەرە - لەگەڵ ئەوەی كە سەرنجی تێدایە- ناكەوێتە بەشی بە بەندە كردنی كەسانی ترەوە ، بەڵكو لە بەشی بە گەورەگرتنە بە تاشینی سەری ، هەندێك لە ئەهلی عیلمیش ئەوەیان فەرمووە و بنچینەی شەرعیشی هەیە ، كە بریتییە لە پەكخستن و لەناوبردنی شوێنی تاوان ، وەكو ڕشتنی كۆپەڵەی عارەق و شكاندنی شووشەكانی

و سوتاندنی دوکانی مەی فرۆشتن و دڕاندنی جلوبەرگی ئاوریشم و هەروەها ، ناکەونە ئەم بەشەوە ، هەروەها سەرتاشینی قوتابی لەلایەن مامۆستاوە لەلایەنی پاکوخاوێنییەوەیە ، نەك بە بەندەکردن ، هەروەکو سەرتاشینی کوڕ لەلایەن باوکییەوە ، لە پێغەمبەریشەوە صلی اللە علیە وسلم هاتووە کە سەری جعفری کوڕی أبو طابلی تاشیوە . لێرەدا جیاوازی لە نێوان ئەو دوو شتەدا هەیە . ئەگەرچی ئەم بابەتە لە سەربازیدا لەلات کەڵەکەبووە ، واز لەوە بهێنە و سەیری ئەم بابەتانەیتر بکە بۆ نمونە دادگای سەربازی و سڵاوی سەربازی و ڕاوەستان بۆ ئاڵا و شیرکی گوێڕایەڵی و بێجگە لەوانە .

**61/ پرسیار : هەندێك برا دەڵێن : سڵاوی سەربازی لە بەشی خۆچوواندنە بە موشریکان ، فەتوای شێخ حمود التویجریشی لەسەرە ، ئەگەر بوترێت ئەوانە یەك ئەستێرە لە پەلی خۆیان بەرزکراونەتەوە ، بە گەورە دانانی بێ گیانیش دروستنییە ، منیش دەڵێم : هەموو بە گەورەدانانێکی بێگیان شیرك نییە ، بەڵکو دەکرێت بە چەند بەشێکەوە : تیایدا هەیە کە فەرمانی پێ کراوە بە گەورە دابنرێت ، وەکو بەگەورە دانانی بەردە ڕەشەکە و دەست لێدانی ، هەشە کە بە گەورە دانانی بیدعەیە و هۆکارێکە بەرەو شیرك وەکو گۆڕی پیاوچاکان بە ڕازاندنەوە و بەرزکردنەوەی لە شوێنی خۆیەوە ، ابن القیمیش باسی ئەوەی کردووە کە ئەو شتانە ڕێڕەو و هۆکارێکن بۆ شیرك ، هەروەها ئەوەی کە چاوەزار هەڵدەواسێت و باوەڕی وایە کە هۆکارێکە لە هۆکارەکان بۆ ئەوەی لە چاوی پیس بیپارێزێت ، بیدعەیە و ناگاتە ڕادەی شیرك ، بەڵام ئەگەر بڕوای وابێت ئەو چاوەزارە سوود و زیان دەگەیەنێت ئەوە کەوتۆتە ناو شیرکی گەورەوە ، زانراویشە کە سەربازەکە باوەڕی بە سوود و زیانی ئەستێرەکە نییە ، بەڵام ڕێزی لێ دەگرێت لەبەرئەوەی کە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی بەرزبوونەوە ، لەم کاتەدا بریتیە لە شیرکی بچوك .**

**ڕەددی ئەم شوبهەیە چییە؟**

وەڵام : بابەتی سڵاوی سەربازی قسەکردن لەبارەیەوە درێژە ، هەوڵدەدەم کورتی بکەمەوە پاشان قسە لەسەر ئەو شوبهەیە بکەم کە باست کردووە ، دەڵێم :

ئەو کارە ئەگەر جێگیربوو کە بەندایەتی کردنە بۆ خوا و بۆ بێجگە لە خوای کرد ئەوە شیرکە ، بەڵام ئەگەر بەندایەتی نەبوو بەڵکو نەهی لێکردنی کارەکە جێگیربوو بوو ، ئەوە ئەو کارە

حەرامە ، بە هەمان شێوە وەکو هەستانە -کە بابەتی ئێمەیە لێرەدا- ، هەستان وەکو زانراوە سێ جۆرە : دوو جۆریان نەهی لێکردنی جێگیربووە :

- هەستان لەبەر کەسێك ﴿من أحب أن يمتثل الناس له قياما...الحديث. واتە: هەر کەسێك حەز بکات خەڵك لەبەری هەستێت ... فەرموودەکە﴾

- هەستان بۆ کەسێك ﴿إن كنتم آنفا لتفعلون فعل فارس و الروم يقومون على ملوكهم و هم قعود فلا تفعلوا . واتە : ئەگەر پێشتر وەکو کارەکانی فارس و ڕۆمتان دەکرد کە لەبەردەم مەلیکەکانیاندا بە پێوەبوون و ئەوانیش دانیشتبوون ئەوا ئیتر ئەو کارە وازلێ بهێنن و مەیکەن﴾

ئەم دوو جۆرە حەرامن و نەهیکردن لێیان جێگیربووە و شیرك نین ، بەڵام هەستان بە سیفەتی ملکەچی ئەوە بەندایەتی کردنە بۆ خوا سبحانە ، کە فەرمانێکی زیادە لەسەر کرداری هەستانەکە بە تەنها ، هەروەکو خوای تعالی دەفەرموێت : ﴿وقوموا لله قانتين﴾ واتە: بە گەردن کەچییەوە هەستن بەدەم فەرمانەکانی خواوە . لە صحیحدا تەفسیری قنوت لە فەرموودەی  زیدی کوڕی أرقمەوە جێگیربووە کە : ﴿فأمرنا بالسكوت و نهينا عن الكلام﴾ واتە: فەرمانمان پێکرا بێدەنگبین و نەهیمان لێکرا لە قسە کردن . جا وێنەی ئەو جۆرە هەستانە بەو شێوەیە ئەگەر بۆ بێجگە لە خوا کرا ئەوە شیرکە ، جا ئەو شتە هەر شتێك بێت مرۆڤ بێت یان دار بێت یان بەرد بێت یان هەر شتێکی تربێت وەکو یەکە . ئەوەشی کە زانراوە ئەو هەستان و ملکەچییەی کە لە سەربازیدا هەیە گەورەتر و توندترە لە ملکەچی لەکاتی نوێژدا ، لە نوێژدا دەخوێنێت و جووڵەیەکی کەمیش ئەگەر بیکات دروستە ، هەروەها بڵاوکردنەوەی قاچەکانت و کوشتنی دوو ڕەشەکە﴿الأسودين:دوو ڕەشەکە واتە مار و

دووپشك/وەرگێڕ﴾ و هەڵگرتنی منالّ و هەروەها . ئەوانە هەمووی ئاگاداری لێكراوە لە سەربازیدا ، زیاد لەوەش دەست بەرزكردنەوە بۆ ناوچەوان یان بۆ چەك و هەروەها ، بریتیە لە شێوازێكی بەندایەتی بۆ بێجگە لە خوا ، هەروەها لەگەڵ قاچ پیاكێشان وەكو ملكەچییەك بۆی ، وەكو لە فەرموودەیەكی صحیحی بەربڵاودا هاتووە : ﴿ضربت الملائكة بأجنحتها خضعانا لقوله﴾ واتە : فریشتەكان لە شەقەی باڵیان دەدەن وەكو ملكەچییەك بۆ فەرموودەی خوای تعالی . هەموو ئەو كارانە لەو هەستانەی كە هەیە لە سەربازیدا دادەنرێت جا بۆ فەرماندەكە بێت یان بۆ ئەستێرە یان بۆ ئاڵا وەكو یەكە و لە بەشی بەندایەتیدایە ، پەند وەرگرتنیش بە ڕاستی كارەكان و واتاكانیانە ، بەڵكو زۆر زیاتر تێپەڕیوە لەوەی كە لە نوێژدا هەیە وەكو پێشتر باسمان كرد .

ئەگەر ئەمە جێگیربوو ئیتر هەموو ئەو شوبهانەی كە دەیهێنن وەكو ئەو قسەیەیان لەبارەی بەردە ڕەشەكە و بێجگە لەو لادەچێت و نامێنێت ، ئەمەش بەشێكی ترە و بە تەواوی لەگەڵ ئەوەدا جیاوازە ، ئەگەر كەسێك بەندایەتی بۆ بەردە ڕەشەكە و كەعبە بكات ئەو كەسە تەكفیر دەكرێت . ئەو شیركەشی كە لە سەربازیدا هەیە و باسكرا بەس بە تەنها بە گەورە دانان نییە ، بەڵكو بە گەورە دانانێكی شیركییە ، ئەم برایەشمان خوا سەركەتوو و سەرفرازی بكات یەك ئاستی وەرگرتووە بۆ وشەی گەورە و تێبینی جیاوازییەكانی نەكردووە ، داوا لە خوا سبحانە دەكەم كە سەركوتوو و سەرفرازمان بكات بۆ ئەو شتەی كە خۆی خۆشی دەوێت و پێی ڕازییە.
شیخ ناصر خوا بیپارێزێت لە شوێنێكی تردا دەفەرموێت : ئەم سڵاو و ملكەچییە بۆ پلەیە (ئەستێرە و هێما) ، چونكە نیشانەیەكە بۆ مەلیك و ناویان ناوە بەڕێوەبەرایەتی مەلیك ، لەگەڵ ئەوەی كە بەندایەتی بۆ بێجگە لە خوا جیاوازی ناخاتە نێوان بەندایەتی كردن بۆ مرۆڤ

یان بۆ بەردێك ، مەگەر ئەوەی بیانوو ببڕێت لەوانەی کە ئەو کارە لە ڕەگەزی سەجدە بردنی ڕێز دادەنێن کە لە شەریعەتی ئێمەدا سڕاوەتەوە ، چونکە ئەو شتە وێنا ناکرێت لەگەڵ بەرد و بێ گیانەکاندا ، ئەوانەش هەمووی  یاسای بۆ دەرکراوە و هەرکەسێکیش پێوەی پابەند نەبێت سزا دەدرێت وەکو چۆن کەسێك سزا دەدرێت ئەگەر واز لە نوێژەکانی بهێنێت ، بیر لەو هەموو شتە بکەرەوە و واز لە خوونەریت و سۆز و ئەو شتانە بهێنە ، گومانی تێدانییە کە بەندایەتییەکی شیرکییە بۆ بێجگە لە خوا و شیرکی گەورەیە ، ئەمە کورتەی قسەبوو لەو بارەیەوە ، خوا پشتیوانت بێت و بتپارێزێت و ئازادت بکات .

## **62/ پرسیار : ئایا سەربازی بە کۆمەڵی ڕێگر(طائفة ممتنعة) دادەنرێت؟ و ئەو هەڵوەشێنەرەوانە چین کە دەیانگرێتەوە؟**

وەڵام : سەربازی دیارترین نمونەیە لەسەر بابەتی کۆمەڵی ڕێگر لە پابەندبوون بە هەندێك لە شەریعەتی ئیسلامەوە ، ئەمەش زۆر ئاشکرایە ، لە الدرر السنیةدا (بەرگی 15و16) بەشێکی تایبەتی تێدایە لەبارەی پۆلیسەوە ، ئەوەشی کە پێشەوایانی بانگەوازی نەجدی باسیان کردووە ، لە شتە حەرامەکانی سەردەمدا باسیان کردووە کە بریتیە لە خۆچوواندن بە کافران لە جلوبەرگ و ڕێکخستن و سڵاوی سەربازی  و موسیقا و شتی تریش. شیخ حمود التویجري ڕەحمەتی خوای لێبێت باسی ئەو بابەتەی لە کتێبی ﴿الإیضاح و التبیین لما وقع فیه الأکثرون من مشابهة المشرکین﴾ کردووە لەسەر سەربازی و ئەو مونکەرانەی کە تێیدایە ، وەکو سڵاوی سەربازی  و پێ کێشان بە زەویدا و جلوبەرگ و کڵاو و مۆسیقا و شتی تریش ، ابن باز پێشەکی بۆ نووسیوە . هەروەها لە فەتوای لجنة الدائمةدا کۆمەڵێك فەتوا هەن لەسەر

مونکەراتی سەربازی ، ئەمانە هەمووی بەسن بۆ ئەو کەسەی کە گفتوگۆت لەوبارەیەوە لەگەڵ دەکات ئەگەر حەقی بوێت . ئاگات لەو کەسە بێت کە دەڵێت کوفر نییە و تەنها مونکەرە یان حەرامە ، ئەمە فەتوای شێخەکانتە لەسەری ، بە هیچ جۆرێك دروستنییە کار بەو قسەیە بکەیت ، ئەگەر چیش پابەند نەبیت بە ڕێکخراوەکەیانەوە ، چونکە یارمەتیدانی لەسەر تاوان و دوژمنایەتی و بەهێزکردنی هێز و توانایانی تێدایە و ژمارەیانی پێ زۆر دەبێت و شتی تریش بێجگە لەوانە .

ئەو مونکەرانەشی کە تێیدایە زۆر زۆرن هەروەکو پێشتر باس کرد ، لەوانە :

1- شیرکی گوێڕایەڵی : لە دیارترین وێنەکان ئەم جۆرە شیرکەیە ، چونکە بنەمایەکیان هەیە ﴿نفذ ثم اعترض . واتە : جێبەجێی بکە پاشان ڕەخنە بگرە﴾ هەمووشیان فەرمانیان پێکراوە کە بە ڕەهایی گوێڕایەڵی ئەوانەی سەرووی خۆیان بکەن ، پێوانەش لە فەرمانەکاندا سیستمەکەیە نەك شەرع ، ئەگەر فەرمانی بە شتێك کرد کە سیستمەکە ڕێگەی پێدابوو ئەگەرچیش لەڕووی شەرعەوە حەرام بێت ئەوە پێویستە لەسەری جێبەجێی بکات ، بە پێچەوانەشەوە هەروایە .

2- شیرکی سڵاوی سەربازی و سڵاوی ئاڵا ، لە ساڵی 1414ك ڕاپۆرتێکم لەسەر ئەوە نووسیوە .

3- حوکمکردن بە غەیری ئەوەی کە خوا دایبەزاندووە ، ئەمەش لەبەرئەوەی کە ئەوان دادگای تایبەتی خۆیان هەیە و بریتییە لە دادگای سەربازیی ، حوکم بە طاغوت دەکات نەك شەرع ، کێشە و دۆسیە سەربازییەکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەویٚ .

4- ئەوەیە کە دەمارگیری و شەڕ و هێزو توانایان لەگەڵ سیستمەکەدایە نەك لەگەڵ شەرع ، هەروەکو شیخ الإسلام لەبارەی سەربازانی تەتارەوە کە دەخرانە سەر ئیسلام دەیفەرموو ، دوای ئەوەی کە حوکمیدا بەوەی کە ئەوانە مورتەدن فەرمووی : شەڕکردن لەگەڵیان لەسەر دینی ئیسلام نییە بەڵکو لەگەڵ دەوڵەتی تەتاردایە .

5- هەموو ئەو شتانەی کە بڵاوبوونەتەوە لە کوفر و دادگای طاغوتان و خۆبردنە پێشەوە و گرتنی بەرەی کافران و بێجگە لەوانە ، هەمووی بە هۆی ئەوانەوەیە کە دەیانپارێزن و پشتیان دەگرن .

6- زۆربەی ئەوانەی کە تێیدایە لە کافرانەوە وەرگیراوە ، هەر لە سەرەتاکەیەوە کە جلوبەرگ و پلەیە ، هەتا کۆتاییەکەی کە حوکمی سەربازییە ، کە بە ڕێگەی خوێندن و سەفەرکردن و بێجگە لەوانەدا ڕۆیشتووە .

قسەکردنیش لەوبارەیەوە درێژە دەکێشێت ، ئەمەش ئاماژەیەکە و باشترە لە ڕستە زۆرەکان ، والله أعلم .

## 63/ پرسیار : ئایا وازهێنان لە سوپای سوریا بەوە دادەنرێت کە کەسەکە تەوبەی کردووە و وخۆی بەری کردووە لێیان ؟

وەڵام : تەنها وازهێان لێیان بە تەوبە هەژمار ناکرێت ، ئەوەش دیارە ، بەڵکو پێویستە لەسەری کە باوەڕ بە خوا بهێنێت و کوفر بە طاغوت بکات ، وەکو بەعس و حوکمکردنیان بە غەیری ئەوەی کە خوا دایبەزاندووە ، هەروەها هەموو ئەوانەی کە تەوحید هەڵدەوەشێننەوە ، ئەوەشی کە ئاشکرایە زۆربەی ئەو وازهێنانانە بۆ بە دەستهێنانی دەستکەوتەکانی دنیایە ،

یان لەبەر لاوازییانە یان لەبەرئەوەیە کە ڕقیان لە بەشار و دارودەستەکەیەتی ، یان بۆ دەستکەوتنی پلەوپایەی دوای ئەوە یان لەبەر ترسانیانە لە شۆڕشگێڕان یان لەبەر شتی ترە .
ئەوانە چونکە کوفر بە طاغوتیان نەهێناوەتە جێ و تەوحیدیان تێدا بەر قەرار نەبووە ، هیچیان بۆ زیادنەبووە تەنها ئەوەنەبێت کە لە کوفرێکەوە چوونەتە ناو کوفرێکی ترەوە ، واللە المستعان .

## 64/ پرسیار : حوکمی ڕۆیشتن بۆ لای دەزگاکانی مافی مرۆڤ و ستەملێکراوان چییە بۆ وەرگرتنی مافی شەرعی ؟

وەڵام : کارکردن لەگەڵ کافران بۆ بە دەست هێنانەوەی مافەکان و بەرپاکردنی دادپەروەری دروستە بە مەرجی ئەوەی کە بە گەورەیان نەزانی ، سیستەم و یاساکانیان بە گەورە نەزانی و ملکەچ نەبیت بۆی ، بەڵگەش لەسەر ئەوە چیرۆکی حلف الفضول و چیرۆکی کۆچکردنە بۆ حەبەشە و چیرۆکی پێغەمبەر صلى الله عليه سلم و چوونە پەنای المطعمی کوڕی عدي و چیرۆکی أبوبکر ﴿خوا لێی ڕازی بێت﴾ و چوونە پەنای ابن الدغنة و چوونە پەنای عمر ﴿خوا لێی ڕازی بێت﴾ لەگەڵ العاصی کوڕی وائلی السهمي و چوونە پەنای عثمان ﴿خوا لێی ڕازی بێت﴾ لەگەڵ الولیدی کوڕی المغیرة ، و شتی تریش بێجگە لەو ڕووداوانە . ئەگەر یەکێك بچێت بۆ لای ئەو ڕێکخراوە کافرانە و وەسفی حاڵی خۆیانی بۆ بکات لە ئەشکەنجە و ستەم و ئەو جۆرە شتانە و بانگیان بکات بۆ فشار دروستکردن لەسەر ستەمکاران بەبێ پیاهەڵدانیان و ملکەچی بۆ سیستەمەکەیان ئەوە هیچی تێدا نییە ، واللە أعلم .

داوا له‌ خوا ده‌كه‌م كه‌ ڕێنمونی ئێمه‌ش و ئێوه‌ش بكات و پته‌وی و پێ دامه‌زراویمان پێ ببه‌خشێت هه‌تا مردن و بیكات به‌ بیانوویه‌ك بۆ لێ خۆشبوونمان و سوودمان پێ بگه‌یه‌نێت .

وصلى الله وسلم على نبينا محمد و على آله وصحبه أجمعين ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين

وآخر دعوانا أن الحمدلله ربّ العالمين

# پێرست